بسم الله الرحمن الرحيم

**ناوی کتێب: موسوڵمانی ئیجابی**

**نووسینی: د.عبدالکريم بکار**

**وەرگێڕانی: بەهجەت جەمیل حامد**

**پێداچوونەوەی: بەهرە محمدعلی**


لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە (١٦٠٢)ی ساڵی (٢٠١٤) ی پێ دراوە



# لا مەکەرەوە تا زوو بگەیت

**خوێنەری بەڕێز:**

**ژمارەی وشەکانی ئەم کتێبە نزیکەی ١٢٥٠٠ وشەیە، ئەگەر لە خولەکێکدا ١٦٥ وشە بخوێنیتەوە، ئەوا تۆ پێویستیت بە نزیکەی ٧٦ خولەکە تا لە خوێندنەوەی ئەم کتێبە ببیتەوە.. دەبا قۆڵی مەردایەتی لێ هەڵبکەین و لێبنەوین و دەسپێبکەین.**

# دەسپێك

سوپاس و ستایش بۆ خـوای جیهانیـان، درووود و سـڵاو بـۆ سـەر گیانی پـاکی بەنـدە و پێغەمبـەری خـۆی موحەممـەد (درووودی خـوای لەسەر بێت) و یار و یاوەران و شوێنکەوتووانی تا ڕۆژی دوایی.

## پێناسەی ئەرێنیبوون (ئیجابی بوون):

پێناسـەیەکی ڕوون و پڕاوپـڕم بـۆ ئـەرێنیبوون دەسـت نەکـەوت؛ بـەڵام دەتـوانین پێناسـەیەکی بـۆ بکـەین و بڵـێین: مەبەسـت لـە ئـەرێنیبوون بـوونی ئاسـتێکی بەرزە لـە بـواری هـزر و بیرکردنـەوە و دەروونداا بە چەشـنێك کـە هەسـتکردن بـە ئـارامیی و ئاسـوودەیی و، بەرهەمی نایاب و، پەیوەندیی کۆمەڵایەتی سەرکەوتووی لێبکەوێتەوە.

مرۆڤـی ئـەرێنیی (ئیجـابی) کەسـێکی دڵسـۆز و سـەرکەوتوو و کراوەیە و، ڕووخـۆش و دەم بەخەندەیـە، تێگەیشـتووە، نموونەیـەکی جـوان پێشـکەش بـە خـەڵك دەکـات. گـەلیش هەمیشـە پێویسـتی بـە کەسانی لەو شێوەیەیە.

مرۆڤی ئەرێنیی کەسێکی ئاسوودەیە و خاوەنی دڵ و دەروونێکی ئارامـە، هـەڵگری سـیفەتەکانی دەروونـی ئـارام و ئاسـوودە و، هەڵسوکەوت و ڕەفتاری بەرز و جوانە.

ئەمانە هەموویان پێکەوە کەسایەتی مرۆڤی ئەرێنیی پێکدەهێنن.

خەڵکانێکی زۆر وا لە مرۆڤی ئەرێنیی گەیشتوون کە کەسێکی خۆگونجێن و ئاسانکار و سازشکەرە، هەر شتێکی پێبڵێیت پێی ڕازی دەبێت! کە لە ڕاستیدا ئەوە واتای مرۆڤی ئەرێنیی ناگەیەنێت.

## بیرکردنەوەی ئەرێنیی (ئیجابی):

بیرکردنەوەی ئەرێنیی بەشێکە لە ئەرێنیبوون، هەروەها بەشێکی گرنگ و سەرەکیی ئەو کەسەشە کە بە شێوازێکی ئەرێنیی و باش بیردەکاتەوە.

ئەرێنیبوون پەیوەستە بە هزر و بیروباوەڕ و، دڵ و دەروون و، هەڵسوکەوت و ڕەفتارەوە.

بیرکردنەوەی ئەرێنیی بەندە بە هزر و بیروباوەڕەوە.

بۆیە دەتوانین بڵێین: جۆرە چوونیەکییەك و، لە هەمان کاتدا جوودایيەك لە نێوانیاندا بەدیدەکرێت.

ئەرێنیبوون کۆمەڵێك بۆچوون و بیروباوەڕە وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد، بەڵام بیرکردنەوەی ئەرێنیی سوودوەرگرتنە لە توانای عەقڵ و ئاوەزی ناوەکیی (نەست) لە هەڵگرتن و پاراستنی بۆچوون و بیروباوەڕە بەرهەمهاتوو و دروستەکاندا، جا کاتێك کە ئەو

بۆچوون و بیروباوەڕانە لە نەستدا هەڵدەگیرێن و دەپارێزرێن، پاش ماوەیەك دەبنە بزوێنەرێکی شاراوە و نەبینراوی هەڵوێست و ڕەفتارەکانمان.

## عەقڵ و ئاوەزی بەئاگا (هەست) و عەقڵ و ئاوەزی نائاگا (نەست):

کەسانێکی زۆر هەن کە جیاوازیی ناکەن لە نێوان و هەست و نەستدا و، عەقڵ و ئاوەزی نائاگا یا عەقڵی ناوەکیی دەچوێنن بە بناغەی ڕۆچووی شاخی بەستەڵەك لەناو ئاودا، کە بەشی گەورەی شاخەکەیە.

بەشی گەورەی شاخە بەستەڵەکەکە لە ناو ئاودا نوقوم بووە و، بەشە بچووکەکەی سەر ئاو دەکەوێت.

کاتێك کە هەر ڕەفتارێك دووبارە دەکەینەوە، ئەوا عەقڵی ناوەکیمان ئەو ڕەفتارە وەردەگرێت و دەیپارێزێت، ئینجا لە کاتی پێویستدا هاوکاریی عەقڵی بەئاگا دەکات کە ئەو ڕەفتارە بەکار بهێنێت.

بۆ نموونە: لێخوڕینی ئۆتۆمبێل.

ئەو کەسەی کە دەستی بە فێربوونی لێخوڕینی ئۆتۆمبێل کردووە، چەند ڕۆژێکی پێدەچێت تاوەکو جووڵەکانی لێخووڕین بەتەواوەتی فێر دەبێت، وەك جووڵەکردن بە ئۆتۆمبێل و پێچکردنەوە

و خێرایی پێویست و پێنان بە ئیستۆپ و بەنزین و کلاجدا.. تەواوی ئەو شتانە پێویستیان بە کات هەیە تا بە تەواویی لە عەقڵ و ئاوەزی نائاگادا بچەسپێن، جا کە لە عەقڵی ناوەکیدا چەسپین ئەوا مرۆڤ دەتوانێت ئۆتۆمبێل لێبخوڕێت و لە هەمان کاتیشدا بە گەلێك کاری دیکەش هەستێت؛ وەك ئەوەی هاوڕێکەی تەنیشتی بدوێنێت، چونکە ئیدی عەقڵی ناوەکی تەواوی ئەو جموجووڵانەی بۆ ئاسان دەکات کە پێویستن بۆ کاری لێخوڕینەکە، ئەگەرچی عەقڵی بەئاگا و دەرەکیش سەرگەرمی شتانێکی تر بێت[1].

**نموونەی دووەم:**

گەر بێینە سەر باسی بواری پەروەردە.. گریمان پیاوێك بەردەوام بە منداڵەکەی دەڵێت: تۆ کەسێکی بێخێریت، تۆ کەسێکی شکستخواردوویت، تۆ لە داهاتوودا هیچت لێ سەوز نابێت و بەکەڵکی هیچ نایەیت..!

بەداخەوە هەندێك لە دایکان و باوکان و هەندێك مامۆستایش خەریکی چەسپاندنی ئەم جۆرە قسە و بیروبۆچوونانەن لە مێشکی نەوەکاندا، کاتێك کە ئەم جۆرە وشانە بۆ چەند جارێك بە گوێی

---

١- تێبینی: هەموومان دووچاری گرفتی قسەکردن بە مۆبایل بووینەتەوە لە کاتی لێخوڕیندا، ئەوەش کارێکی زۆر مەترسیدارە؛ چونکە ئاستی ئاگایی مرۆڤ دادەبەزێت بۆ نیوە، بۆیە هەر ڕووداوێکی تووش بێت ئەوا ناتوانێت زاڵبێت بەسەریدا.. لەبەر ئەوە تکام وایە لە کاتی لێخوڕیندا مۆبایل بەکار نەهێنرێت. (د. بکار).

منداڵدا دەدرێن لە لایەن کەسانێکەوە کە دەسەڵاتیان بەسەریەوە هەیە، ئیدی ئەو قسەیە لە عەقڵی ناوەکییدا جێی خۆی خۆش دەکات، هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا هەستی بێزاریی و دڵتەنگیی بەسەریدا زاڵ دەبێت، بۆیە کاتێك کە گوێی لەو قسانە دەبێت پەست دەبێت و هەست بە نائومێدیی و بێزاریی و تووڕەبوون دەکات، هەربۆیە ئەم منداڵە هەرکاتێك بیەوێت توانا و خودی خۆی بسەلمێنێت، یا بیەوێت هەنگاوێك بەرەو پێشەوە بچێت، یا لە کارێکدا سەرکەوتن بەدەست بهێنێت دەسبەجێ قسەکەی باوکی وەبیر دێتەوە کە پێی گوتووە ئەو کەسێکی بێخێر و بێکەڵکە، هاوکات هەستی بێزاریی و دڵتەنگیی و نائومێدیی باڵ دەکێشێت بە سەریدا، ئەوسا ئیتر خەم دایدەگرێت و ناتوانێت بە هیچ جۆرە دەسپێشخەرییەك هەستێت، چونکە قسەکانی باوکی هاتوونەتە دی، کەواتە باوکی لەخۆڕا وای نەوتووە، دەی مادام باوکی لەو گەورەترە کەواتە شارەزایی زیاترە و ڕاست دەکات..

ئا بەو شێوەیە ئەو منداڵە هەمیشە بە چاوێکی سووکەوە تەماشای خۆی دەکات و، خۆی بە کەسێکی شکستخواردوو و تێکشکاو دەزانێت، ئەمەش دواجار ئەنجامی خراپی لێدەکەوێتەوە.. ئەو ئەنجامە خراپانەش پشتیوانی وتەی باوکەکە دەکەن و پشتڕاستی دەکەنەوە، بۆیە هەر دەرەنجامێکی خراپ کە لەو منداڵە بوەشێتەوە، خێرا باوکی پێی دەڵێت: ئەی من پێم نەوتیت تۆ و خوێندنیان نەوتووە.. بابە، واز لە خوێندن بهێنە! ئیدی بڕوا بەو قسەیەی باوکی

دەكات و دەڵێت: باوكم دە ساڵ بەر لە ئێستا پێی گوتم كە من و خوێندنیان نەوتووە.

كێشەكە لێرەوە سەر هەڵدەدات، چونكە منداڵەكە بەهۆی قسە ڕووخێنەرەكانی باوكییەوە كە لە عەقڵی ناوەكییدا هەڵگیراون و، ئەو هەستەشی كە لەو قسانە دەوەشێتەوە، دەكەوێتە ناو بازنەیەكی داخراوی خراپەوە. چیمان لە كیس دەچێت ئەگەر بێتو تۆوی هیوا و ئومێد لە مێشك و دڵ و دەروونی منداڵاندا بچێنین و هانیان بدەین و پێیان بڵێین كە ئاسۆی ئایندە بە تواناكانی ئەوانەوە جوانە.

### نموونەی سێیەم:

منداڵێك باوك یان دایكی هەستێكی وەهای لا دروست دەكات بەوەی كە هەرچەندە بكەوێتە هەڵەشەوە، هیچ لە خۆشەویستی ئەو لە دڵی خێزانەكەی كەم ناكاتەوە و ئەوان هەر خۆشیان دەوێت و گرنگی پێدەدەن. ئەم منداڵە لە هەوڵ و كۆشش ناكەوێت و، بەردەوام بێ سڵەمینەوە و ترس لە شكست خەریكی تاقیكردنەوەی چەندین كاری نوێ دەبێت، ئەمەش هانی دەدات كە دەسپێشخەریی بكات و خۆی بخاتە مەترسییەوە و بەرپرسیاریەتی لە ئەستۆ بگرێت؛ چونكە هەر كاتێك بیەوێت دەسپێشخەریی بكات لە كارێكدا، عەقڵی ناوەكیی نامەی خێزانەكەی بۆ دەنێرێت و پێی دەڵێت: تاقیی بكەرەوە و مەترسە سەرەنجامەكەی هەرچییەك بێت تۆ هەر لە دڵدا شیرینیت.

بۆیە من پێم باشە کەمتەرخەمی نەکەین لە هاندان و ستایش و دەستخۆشی لێکردنیاندا بەبێ زیادەڕەویکردن و، دووربکەوینەوە لەو وشە و قسانەی کە دەروونی منداڵ وێران دەکات و کەسێتیی دەشکێنێت و وای نیشان دەدات کە کەسێکی بێکەڵکە و هیچ نازانێت و بۆ هیچ ناشێت و، ئایندەیەکی خراپ چاوەڕێی دەکات، چونکە ئەو جۆرە قسانە کە چەندبارە بوونەوە لە عەقڵی ناوەکییدا جێگیر دەبن و، هەر کاتێك عەقڵی دەرەکیی (هەست) پێویستی پێیان بوو لە کات و شوێنی خۆیدا دەستی کۆمەکی بۆ درێژ دەکات.

کەواتە: بیرکرنەوەی ئەرێنیی و باش شتێکی سەرەکییە لە ئەرێنیبووندا و، دەبێت بە چاوی پڕ بایەخەوە تەماشای بکرێت و گرنگی پێبدرێت.

## سوودوەرگرتن لە عەقڵ و ئاوەزی ناوەکیی:

بێگومان گەلێك ڕێ و شوێن و گوفتار و ڕەفتار هەن کە دەتوانرێت سوودیان لێ ببینرێت لە شێوازی کاری عەقڵی ناوەکیدا؛ واتە: بابەتی وەرگرتن و هەڵگرتن و پاراستنی زانیارییەکان و دانەوەیان لە کاتی پێویستدا.

**سوودوەرگرتن لە عەقڵی ناوەکی بە ڕەچاوکردنی ئەم کارانەی خوارەوە دەبێت:**

**یەکەم: دووبارەکردنەوە.**

واتە کەسەکە دووبارەی بکاتەوە لە خۆی.

پێویستە لەسەر ئێمەی باوك و دایك و پەروەرشیار، قسە و گوفتارە جوان و چێژبەخشەکان هەم لەسەر منداڵان و هەمیش لەسەر خۆمان دووبارە و دووپات بکەینەوە، وەك ئەوەی بڵێین: (خوا یار بێت سبەینێ لەمڕۆ باشتر دەبم، یان بڵێین: من بەردەوام خۆم فێردەکەم، لەمڕۆ بەدواوە تووڕە نابم، هیچ کەس ناتوانێت بە چاوی سووکەوە تەماشام بکات و هەروا بە ئاسانی گاڵتەم پێبکات).

بۆیە زۆر گرنگە کە بزانین هەرچی زانیاریی و ڕەفتار هەیە بۆ ئەوەی کە لە عەقڵ و ئاوەزی ناوەکیدا هەم بمێنێتەوە و ببەخشرێتەوە و، لە دواییشدا کاریگەریی لەسەر هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانمان بەجێ بهێڵێت، پێویستە چەند جارێك دووبارە ببێتەوە.

منداڵێك ئەگەر تەنها جارێك لە ژیانیدا باوکی پێی وت: (تۆ بێ خێریت و هیچ کەڵکێکت نییە) و پاشان ستایشی کرد و دەستخۆشی لێکرد، ئەوا ئەو جارە بە تەنها پێویستیی عەقڵی ناوەکیی پڕ ناکاتەوە و ئەو قسە خراپ و ناشیرینە لە مێشکیدا ناچەسپێت ، بەڵام کاتێك کە

ئەو قسەیە دە جار یان بیست جار یان زیاتر دووبارە دەکەیتەوە ئەوسا ئیتر لە عەقڵی ناوەکیی ئەودا دەمێنێتەوە.

سەبارەت بە لێخوڕینی ئۆتۆمبێلیش هەروایە، هەرگیز ڕووینەداوە لە ماوەی دە خولەکدا فێری لێخوڕینی ئۆتۆمبێل ببیت و، چی جووڵە و یاساکانی لێخوڕین هەیە لە مێشکتدا بچەسپێن.

هەمیشە دەرفەتەکانی سەرکەوتن لەبەردەمتدان، دەتوانیت خۆت چاك بکەیت و بەرەو پێشەوە هەنگاو بنێیت.

بە پێچەوانەشەوە مرۆڤی نەرێنیی و ڕەشبین – کە هەمیشە دژی مرۆڤی ئەرێنیی و گەشبین دەوەستێتەوە– قسە و گوفتارە جوان و چاکەکان لە خۆی دووبارە ناکاتەوە، بەڵکو بەردەوام شکست و دۆڕانەکانی ڕۆژانی ڕابوردوو دەهێنێتەوە یادی خۆی و، دەڵێت: (من فڵانە ڕۆژ شکستم هێنا و، فڵانە ڕۆژ کتێبەکانم ونکرد و، من بەختم نییە و، من و من و من..)

ئیدی تۆوی ئەم بیر و بۆچوونانە لە عەقڵ و ئاوەزی ناوەکیی ئەودا چەکەرە دەکەن و دەمێننەوە.

بۆیە دووبارەکردنەوە شتێکی گرنگە، کەواتە پێویستە مکوڕبین لەسەر دووبارەکردنەوەی شتە باش و سوودبەخشەکان، تا بەرەو پێشەوە بچین.

## دووەم: وەبیرهێنانەوەی کارە باش و ئەرێنییەکان.

تاوەکو مرۆڤ سوود لە شێوازی کاری عەقڵی ناوەکیی وەربگرێت، پێویستە کارە باشەکانی وەبیر خۆی بهێنێتەوە.

وەك ئەوەی بڵێت: (سوپاس بۆ خوا نوێژی بەکۆمەڵم لە کیس ناچێت و، من هەمیشە چاکە لەگەڵ باوك و دایکمدا دەکەم و، من وەکو هاوڕێکانم نیم و دەتوانم بۆ ماوەیەکی دووردرێژ ماندوونەناسانە خەریکی کارکردن بم و، هاوڕێکانم خۆشیان دەوێم و زۆر ڕێزم لێدەگرن و..) ئەمانەش هەموویان خاڵی ئەرێنیی و بەهێزن لە مرۆڤدا.

تەواوی ئەم کارانە بۆ ئەوەیە کە عەقڵی ناوەکیمان تێڕوانینی ئەرێنیی و دروستی لەبارەی خود و کەسێتییەوە لەلا دروست ببێت.

## سێیەم: وشەکانی هاندان وەبیرخۆت بهێنەرەوە.

بۆ سوودوەرگرتن لە شێوازەکانی کارکردنی عەقڵی ناوەکیی پێویستە مرۆڤ وشەکانی هاندان کە لە دایکی یان باوکی یاخود هاوڕێکەیەوە گوێی لێدەبێت وەبیر خۆی بهێنێتەوە، تاوەکو بیانکاتە وێستگەیەك بۆ بەرهەمهێنانی متمانەبەخۆبوون.

جا کە دەڵێین لەمەودوا وشە باش و هاندەرەکان لە خۆمان دووبارە دەکەینەوە، پێویستە لەبەرامبەردا دەستبەرداری ئەو وشانە بین کە بە ئاقارێکی نەرێنی و ڕەشبینانەمان دەبەن و لەبیر خۆمانیان بەرینەوە، بەیەکجاریی ئەو دۆسیەیە بپێچینەوە و ڕێگەی پێچانەوەی

دۆسیەکان بگرینەبەر ، نابێت بڵێم: (ئەمە هەڵەیەك بوو کردم و فلانە کەس سەرزەنشتیکردم لەسەری و، فلانە کەس پێی ڕابواردم و، سەرزەنشتی خۆمم کرد و..) دەبێت ئەمانە دووبارە نەکەمەوە و لە مێشکی خۆمدا دەریانبکەم و، لە جیاتییان بڵێم: (ئەوە شتێك بوو ڕوویدا و تێپەڕی و، لەو بڕوایەدام جارێکی تر نەکەومەوە هەڵەی لەو جۆرە).

ئەم جۆرە لەبیربردنەوەیەش- بۆ هەڵەکان- بۆ شێوازی مامەڵەکردنە لەگەڵ عەقڵی ناوەکییدا، بەلام کاتێك کە مرۆڤ بەجیا دەکەوێتە لێپێچینەوە لە هەڵەکانی خۆی، ئەوا پێویستە بڵێت: بەڕاستی دوێنێ کارێکی هەڵەم کرد، بەلام پشتیوان بەخوا ئەم هەڵەیە تێدەپەڕێنم و هەرگیزاوهەرگیز دووبارەی ناکەمەوە.

پێم وایە خوای گەورە و میهرەبانیش تەوبە و گەڕانەوەی بۆ ئەوە داناوە تا ببێتە ئامرازێك بۆ سڕینەوەی ئەم یادەوەریانە، (ئەوەی دەست لە گوناه هەلگرێت و بگەڕێتەوە، وەك ئەوە وایە تاوانی نەکردبێت)، دەڵێت سوپاس بۆ خوا من تەوبەم کردووە و گەڕاومەتەوە و، ئەو قۆناغەی کە هەڵەم تێدا دەکرد بەسەرچووە و، لە خوا دەپاڕێمەوە کە لێم خۆش بێت و، من ئەمڕۆ لاپەڕەیەکی نوێم لەژیانی خۆم هەڵداوەتەوە [١].

---

١- کورد واتەنی: ئەو نانە نانە ئەمڕۆ لەخوانە. (وەرگێڕ)

گومانی تێدا نییە کاتێك کە کەسێك سەرپێچی فەرمانـەکانی خـوا دەکات و گوناهێك ئەنجام دەدات و، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ لای، ئـەوا بەو گەڕانەوەیە سەرکەوتنێکی تۆمارکردووە، ئەو لە سەرەتادا کە ئـەو گونــاهو تاوانـــەی کـــرد دۆڕا و شکســـتی هێنـــا، بـــەڵام دواتـــر بـــە تەوبەکردنەکەی سەرکەوتنی بەدەستهێنا، دەی ئـەو سـەرکەوتنە ئـەو شکســتە دەســڕێتەوە و نایهێڵێــت، وەك جــەنگێك کــە ســەرەتاکەی نوشوسـت بێـت و کۆتاییەکەشـی سـەرکەوتن بێـت، گـرنگ ئەنجامـە، ئەمەش واتای جوانی تەوبەمان بۆ دەردەخات.

هــەروەها ئەمــە هانمــان دەدات کــە هەمیشــە بــۆ لایەنــە جــوان و درەوشـاوەکانی شـتەکان بـڕوانین، چـونکە هەرچـی شـت هەیـە لـەم دونیایەدا دوو لێکدانەوە هەڵدەگرێت: لێکدانەوەیەکی بـاش و ئـەرێنیی هــەروەها لێکدانەوەیـەکی خـراپ و نـەرێنیی؛ چـونکە خێـر و چـاکەی پڕاوپڕ و تەواو لەم دونیایەدا دەگمەنە، لە هەمان کاتدا شەڕ و خراپەی پڕاوپڕ و تەواویش دەگمەنە.

جا گەر بمانەوێت ژیانێکی لێوان لێـو بـە خۆشـی و ئاسـوودەیی و بەختەوەریی بەرینە سەر، ئەوا پێویستە شتە باش و چاکەکان وەبـیر خۆمان بهێنینەوە.

بۆ نموونە: کەسێك ڕووی لـە دەرەوەی وڵات کـردووە و ژیـان لـە تاراوگــە و دوور لــە نیشــتمانەکەی دەباتەســەر، ئــەوەش گرفتــی بــۆ خەڵکێکی زۆر دروسـتکردووە، ژیـانیش لـە تاراوگـە بـۆ خـۆی خـەڵکی

تووشـی کێشـەگەلێك کـردووە کـە لـە نیشـتمانەکەی خۆیـدا بـەدیی نەکردوون، بەڵام پێویستە لەسـەری کـە دیوەکـەی تـری بخوێنێتـەوە، دەسـتکەوتەکانی مرۆڤـی گەشـتیاری بـیر بکەوێتـەوە، لـە زۆربـوونی زانسـت و، شـارەزایی و ئەزموونـداریی و، دەستخسـتنی سـامان و، نوێکردنـەوەی ژیـان و، نوێکردنـەوەی خـود و، هەڵبـژاردنی هـاوڕێ؛ چونکە مرۆڤ لە دەرەوەی ژینگەکەی ناچارە کە هاوڕێی نوێ بۆ خـۆی پەیدا بکات و.. چەندین شتی تر کە دەتوانێت سوودیان لێ ببینێت.

کەوابوو دەبێت بڕوانینە دیوی گەشاوە و درەوشاوەی شتەکان و، لایەنـە باشـەکانیان بهێنینـەوە یـادی خۆمـان؛ چـونکە دەبێتـە هـۆی ئەوەی کە کەسێکی ئەرێنیی و گەشبینمان لێدەربچێت.

کەسی ئەرێنیی و گەشبین لایەنە باشەکانی وڵاتەکەی خۆی وەبیر خۆی دەهێنێتەوە و، بێگومان وڵاتە سەرەکییەکەی خۆی لایەنی بـاش و لایـەنی خراپیشـی تێدایـە، بـەڵام کەسـی نـەرێنیی و ڕەشـبین تـەنها لایەنە خراپەکانی وڵاتە سەرەکییەکەی و ئەو وڵاتەشی کە بۆی چـووە وەبیر خـۆی دەخاتـەوە، بـەو شـێوەیە سـەر لـە خـۆی تێکـدەدات بـە شتێك کە هەر پێویست ناکـات بیریشـی لێبکاتـەوە، ئـاخر چ پێویسـت دەکات خۆت بە شتێکی نابابەتی وەهاوە سەرقاڵ بکەیت.

کەواتـە جەختکردنـەوە لـە لایەنـە بـاش و جوانـەکانی شـتەکان هاوکـارێکی باشــە بــۆ ئــەوەی کــە بــەردەوام عــەقڵی نــاوەکی بــە بیرکردنەوەی ئەرێنیی کۆمەکیمان بکات.

هەروەها کێشەکە کێشەی حەز و ئارەزوو نییە، بەڵکو کێشەی چالاکییە، بۆیە کاتێك کە تۆ هەست دەکەیت ئەو ژینگەیەی کە تێیدا دەژیت ژینگەیەکی نالەبار و نەشیاوە، چۆن دەتوانیت قۆڵی لێ هەڵبماڵیت و، کار بکەیت و، بەرهەم بخەیتەوە؟ تەنانەت لەسەر ئاستی چاکسازیشدا، گەر گەورە چاکسازان تەماشای کەموکوڕیی و لایەنە خراپەکانی کۆمەڵگەکانیان بکردایە، ئەوا هەرگیز کاریان نەدەکرد و هەر لە سەرەتاوە ئالآی سپییان بەرز دەکردەوە و خۆیان ڕادەست دەکرد، بەڵام هەرگیز بە کاری وا هەڵنەستاون، بەڵکو هەمیشە و هەردەم چاویان لەو لایەنە باش و دەستکەوتە کەمانەیە کە لەناو کۆمەڵگەکانیاندا هەن و، دەیانکەنە پردێك بۆ پەڕینەوە بەسەریدا و فراوانکردنیان و، لە هەمان کاتدا گەمارۆی لایەنە خراپ و نەخوازراوەکانیشیان داوە.

بۆیە بایەخدان بە لایەنی درەوشاوە شتێکی گرنگە.. ئەمە هەمووی بۆ ئەوەیە تا بزانین چۆن سوود لە عەقڵی ناوەکی وەربگرین بۆ پێکهێنانی کەسایەتییەکی باش و دروست، چۆن بتوانین هەست و هۆش و بیرکردنەوەمان ئەرێنیی بێت؟ دەبێت دڵشاد و بەختەوەر بین، دڵفراوان و بە بەزەیی بین، ڕووخۆش و دەم بەخەندە بین، وەك لە فەرموودەکەدا باسکراوە: ((**تبسمك في وجه أخيك صدقة**))[1] واتە: ڕووخۆشیت بەرامبەر بە برا موسوڵمانەکەت خێر و چاکەیە.. ((**والكلمة**

---

[1] – الترمذي، رقم: ١٩٥٦

**الطيبة صدقة))**[1] واتە: قسەی جوان و زمانی شیرینیش هەر خێر و چاکەیە. دەی گەشبینیی و مژدەبەخشینیش بەشێکن لەو.

کەسی وا هەیە کاتێك کە پێی دەڵێیت: (پێویستە بەختەوەر بژیت و دڵت خۆش بێت) پێی وایە پۆز لێدەدەیت و خۆت بەو قسانە هەڵدەکێشیت و، دەڵێت: ئاخر چۆن و بەچ شێوەیەك لەم دەریای خەمەدا بەختەوەر بژیم، پێم نالێیت دڵ بەچی خۆش بکەم، ئاشکرایە کە مرۆڤی خەمۆك و ڕەشبین و بێ چارە هەمیشە شتە ناسۆر و ئازاربەخشەکان دەبینێت و شتە جوان و دڵخۆشکەرەکان نابینێت.

لە ڕاستیشدا تۆ کاتێك کە داوا لە کەسێك دەکەیت دڵخۆش بێت، بۆ خۆهەڵکێشان و پۆزلێدان نییە؛ چونکە ئەگەر لە ڕوویەکی تریشەوە سەیری بکەین، ئەو کەسەی دڵخۆش نەبێت ناتوانێت دەوروبەرەکەی دڵخۆش بکات، جا هەر کەسێك تووشی خەمۆکییەکی درێژخایەن بێت، ئەوا ماڵەکەی دەکاتە دۆزەخ، لەوانەشە ئەو کەسە دەرامەتێکی باش و خانوویەکی جوان و کارێکی باشیشی هەبێت، کەچی بەهۆی ئەو خەمۆکییەوە ماڵەکەی بووەتە وێرانە و دۆزەخ.

جا بۆ ئەوەی بتوانیت خۆشی بخەیتە دڵی کەسانی دیکەوە، سەرەتا دڵی خۆت خۆش بکە، تاوەکو کامەرانی باڵ بکێشێت بەسەر ئەو ناوەند و ژینگەیەی کە تۆی تێدا دەژیت.

---

[1]- مسلم، رقم: ٢٢٢٤

## کارانێك كه دڵی مرۆڤ خۆش دەكەن:

من سەرم سووڕ دەمێنێت لە بەندەیەك كە پەیوەندی بە خوای گەورەوە هەیە، بەڵام سوود لەو پەیوەندییە نابینێت لە دڵخۆشكردنی خۆیدا. ! زۆرن ئەو كارانەی كە خۆشی دەخەنە دڵانەوە، لەوانە:

١ـ ماوەی پێنج خولەك مانەوە لە مزگەوتدا لە دوای نوێژ بۆ پاڕانەوە لە خوا.. ئەم كارە زۆرێك لە خەمەكانی دڵ دەڕەوێنێتەوە.

٢ـ موسوڵمان لەیادی بێت كە خوا بەسۆز و میهرەبانە لەگەڵماندا و، بەڵێنی پێداوین كە چاكمان بۆ بكات و پاداشتی ئەو هەموو نەهامەتیانەمان بداتەوە كە لە دونیا بەسەرماندا دێن.

٣ـ كاری چاكە دەبێتە هۆی ئەوەی كە عەقڵی ناوەكیمان بە ئاگا بێنێتەوە و خۆشی بخاتە ناو دڵەكانمانەوە، هەروەها یادكردنەوەی بەخششەكانی خوای گەورە و، لەبەرچاوگرتنی ئەو بەلا و ناڕەحەتییەی كە خوا لایداین لێی و تووشی كەسانی دیكە بوو، ئەمانە هەموو خۆشی دەخەنە دڵەوە.

٤ـ مرۆڤ خۆی ڕابێنێت لەسەر دووركەوتنەوە لە بیركردنەوەی خراپ، وەك بەلا و تووشهاتەكان و، شكست و دۆڕانەكان و، مایەپووچی و، ڕووداوەكانی هاتووچۆ.. هەندێ كەس هەن پێیان وایە كە ئۆتۆمبێلەكەیان هەموو ساتێك مەترسی پێكدادانی لەگەڵ

ئۆتۆمبێلی تردا لێدەکرێت، هەر کاتێکیش دەست بدەنە پرۆژەیەك یان بە کارێك هەستن بیریان بە لای هەلی سەرکەوتنەوە نییە، بەڵکو بیریان بە لای ئەو شکستانەوەیە کە بەسەر خۆیاندا یان کەسانی دیکەدا هاتوون.

گەر بمانەوێت عەقڵ و ئاوەزی ناوەکیمان بە شێوەیەکی باش بخەینەگەڕ، ئەوا پێویستە خۆمان بە بیرکردنەوە لە شتە خراپەکان سەرقاڵ نەکەین، واتە مرۆڤ لەتوانایدا بێت کە بە خۆی بڵێت: (ڕابوەستە، ئیتر بەسە، تەماشایەکی فلانە کەس بکە، وا بۆ پەنجا ساڵ دەچێت خەریکی لێخوڕینی ئۆتۆمبێلە و تووشی هیچ ڕووداوێکیش نەبووە، ئیتر بۆچی من ئەوەندە ڕەشبین بم و بیر لە شتی خراپ بکەمەوە..!)

کاتێك کە پشت بە خوا دەبەستین و بە قەدەری ئەو ڕازی دەبین ئەوسا دڵمان ئاسوودە دەبێت، تۆ تەماشایەکی دیاردەی خۆکوشتن بکە کە لە زۆربەی وڵاتانی جیهان ڕوودەدات چ پاساوێکی هەیە، ئەی ئەو خەڵکە بێ دەرەتانە چی بڵێت کە لە دەشت و زەویەکی کاکی بەکاکی و وشکی ئەفەریقیادا ژیان دەباتە سەر..؟! بڕوانە ئەوانە پەنا بۆ خۆکوشتن نابەن، کەچی ئەوانەی کە لە ناز و نیعمەتدا دەژین دەبینین پەنا بۆ خۆکوشتن دەبەن..! ئەمە سەلمێنەری ئەوەیە کە هەڵەیەك لە تێگەیشتن و تێڕوانین و وێنادا هەیە.

هەروەها پێویستە مرۆڤ دیسان هەوڵ بدات کە بیر و هزرە خراپ و نەرێنییەکان بگۆڕێت بە بیری باش و ئەرێنیی، بۆ نموونە ئەگەر کەسێك ڕاسپێردرا کە هەستێت بە پێشکەشکردنی وتەیەك، ڕەنگە خەمی هەرچی بیری خراپ و نەرێنیی هەیە کە لە کاتی پێشکەشکردنی وتەکەدا دووچاری دەبێت دایبگرێت و، بڵێت: من دەمم تەتەڵە دەکات، من دەکەومە هەڵەوە، لەوانەیە خەڵکی لێم بێزاربن و گوێم لێنەگرن، ڕەنگە ئامادەبوویەك هەستێتە سەر پێی و بڵێت: (ئەم قسە هەڵێت و پەڵیتانە چین، یان ئەم بیروبۆچوونە جێگەی قبوڵکردن نییە) یان لەوانەیە لەتاو شڵەژانیدا پەڕەکەی لە دەست بکەوێتە خوارەوە..

ئەمانە هەموویان بیر و باسی خراپ و نەرێنین، بۆچی بیر و باسی باش و ئەرێنیی نەخەینە جێگەیان؟ بۆچی ناڵێت: ئەم وتارە دەرفەتێکە بۆ من تاوەکو لایەنە باش و خراپەکانی شێوازی پێشکەشکردن و وتاردانم بۆ دەربکەوێت، ئەمە هەلێکی باشە بۆ ئەوەی خۆم ڕابهێنم، فرسەتێکە تاوەکو گوێم لە چەند تێبینییەك بێت لە زاری خەڵکییەوە، لەوانەشە هەندێ لە مامۆستاکانم ئامادەبن، ئەوسا گوێم لە هەڵسەنگاندنی ئەوانیش دەبێت بۆ شێوازی پێشکەشکردنەکەم.

دەبا دەستهەڵگرین لە بیرە خراپ و نەرێنییەکان و، هەوڵی بەدەستهێنانی بیرە باش و ئەرێنییەکان بدەین.

## سەرچاوەی باوەڕپێکراوی ئەرێنیبوون:

زۆربەی ئەو بابەتانەی کە هانی مرۆڤ دەدەن لەسەر ئەرێنیبوون و سەرکەوتن و بەرەوپێشچوون تێکەڵ و دژوارن، هەندێکیان بەپێی شەرع و ئایین ڕێگەپێدراون و لە قورئان و فەرموودەدا ئاماژەیان پێکراوە و، هەندێکیشیان شەرعی نین و سەر بە ڕۆشنبیریی ئیسلامی نین و بە هیچ شێوەیەك توخنی نەکەوتوون.

یاسا ناوازەکانی شەرع و ئایینی ئیسلام خاوێنترین سەرچاوەن بۆ ئێمە، هەر ئەمەش وامان لێدەکات کە تاوتوێی هەموو بابەتێکی بڵاوکراوە بکەین و بیخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە، پێویستە بپرسین: ئەم کارەی ـ کە کارێکی بەرهەمداریشە ـ کە پێی هەڵدەستین لە چییەوە سەرچاوەی گرتووە؟ ئایا لە سەرچاوەیەکی دروستەوە هاتووە یاخود لە سەرچاوەیەکی نادروستەوە هاتووە؟

هەندێ بابەت هەن زۆر ڕوونن و، هەندێکی تریشیان ئەوەندە ورد و دژوارن، خەڵکی زانا و بە ئەزموون و بەرچاوڕوون نەبێت ناتوانێت لێیان تێبگات، بەڵام بەگشتی یاسا ناوازەکانی شەریعەت و بابەتەکانی سەرچاوەی پاك و پوختن و، ڕەوا نییە کە بەو چاوەوە سەیری هەر بیروباوەڕێکی دژ بە شەریعەتی ئیسلام بکرێت کە دەتوانێت موسوڵمان بکاتە کەسێکی ئەرێنیی.

بۆیە پێویستە چی بیر و باس و بابەت هەیە کە هانمان دەدات ئەرێنیی بیر بکەینەوە لە بابەت و یاساکانی شەریعەتەوە وەربگرین.

ئینجا دوای ئەوە سوود لە ئەزموونی چەندین ساڵەی ڕۆشنبیریی و تێگەیشتنی مرۆڤ و ئەو هۆکارانە وەربگرین، تا بتوانین چالاکانەتر و کاراتر پێویستییەکانی ژیانی ئەم سەردەمەمان فەراهەم بکەین.

زۆرینەی خەڵکی پێیان وایە کە مرۆڤی ئەرێنیی کەسێکە مل بە هەموو داواکارییەك دەدات: سازش لەسەر هەموو شتێك دەکات، دانوستان لەسەر هەموو بابەتێك دەکات. !

ئەو بۆچوونە هەڵەیە، چونکە هەمیشە کۆمەڵێك هێڵی سوور هەن دەبێت نەبەزێنرێن، شتانێك هەن سازشیان لەسەر ناکرێت و، ناکڕدرێن و نافرۆشرێن.

خەڵکانێکی زۆر وەها لە ئەرێنیبوون و پیاوچاکی گەیشتوون کە بریتییە لە ملدان و سازشکردن، کەسی پیاوچاك و ئەرێنیی لای ئەوان شلگیرە و، ئامادەیە بۆ فرۆشتن و سازشکردن لەسەر هەر شتێك.. ئەوەش بەتەواوەتی هەڵەیە و، تێگەیشتنێکی ڕۆژئاوایی و بازرگانییە و، لە سیستمی بازرگانییەوە بۆمان هاتووە.

هەندێ کەس وا دەزانن ئەرێنیبوون نەرمونیانییەکی نیمچە ڕەهایە، واتە مرۆڤی ئەرێنیی لە هەموو شتێکدا نەرمی دەنوێنێت.. بەڵێ نەرمونیانی و ئەرێنیبوون پێویستە، بەڵام هەموو شتێك دەبێت

سنووریکی دیاریکراوی هەبێت و، ئەو هێڵە سوورانەی کە هەن نەبەزێنرێن، وەك دەگوترێت: هەموو شتێك بە خوێ و خوێیش بەتام.

بۆ نموونە: بابەت و پرسی سەرکەوتن، هەندێ کەس وا لە سەرکەوتن گەیشتوون کە بەدەستهێنانی پۆست و پلە و پایە و بەدەستخستنی پارە و پوول و پێگە و ناوبانگی کۆمەڵایەتی زیاترە.

لەکاتێکدا لە بەرنامە و تێگەیشتنی ئێمەدا بۆ ژیان: ئەو سەرکەوتنەی کە بەهانای خاوەنەکەیەوە نەیەت لە ڕۆژی دواییدا، ئەوە سەرکەوتنێکی کاتیی و کورتخایەنە، ئەگەرچی بە ڕێگەیەکی شەرعیش بەدەستهاتبێت؛ چونکە ئەم ژیانی دونیایە کورتە، بەو پێیە هەر سەرکەوتنێکیشی تێدا بەدەست بێت دواجار هەر کورتە و تا سەر ناخایەنێت.

جا ئەو سەرکەوتنەی کە بە ڕێگەی نادروست و ناڕەوا بە دەست دێت وەك: سوو یان بەرتیل یان درۆکردن یان فێڵ و فریودان یان چاوپۆشین بە ئەنقەست لە یاسا و ڕێسا باوەکان.. سەرکەوتنێکی خەیاڵییە، خاوەنەکەی خەیاڵ و وڕێنە بە سەرکەوتنەوە دەکات و، دواتر هەر ئەو سەرکەوتنە سەری دەخوات و هەتا هەتایە لە دۆزەخدا دەیهێڵێتەوە.

ئێمە لێکدانەوەمان بۆ تەواوی باس و بابەتە بڵاو و پێشکەشکراوەکان هەیە، بەڵام سەبارەت بەو شتانەی کە ڕاستەوخۆ دەقێکی شەرعی و یاساییان لەبارەوە نەهاتبێت – وەك هەموو

داهێنراوه نوێیەکان – ئاساییە کە سوودیان لێوەربگرین مادام کۆمەکیمان دەکەن لە بەدیهێنانی ئامانجێکی ڕێگەپێدراودا و، پێچەوانەی هیچ دەقێکی شەرعی ناوەستن.

هەرچی بابەتی بیروباوەڕ و عەقیدەیە کە پەیوەندیی بە خوای گەورە و ڕۆژی دوایی و قەزا و قەدەرەوە هەیە، پێویستە لە پرسی ئەرێنیبووندا ئامادەیی هەبێت، وەك دەسەڵات و توانای خوای گەورە لە دەستەبەرکردنی خێر و خۆشی بۆ بەندەکانی.

خوای باڵادەست زیندوو لە مردوو دەردێنێت و مردوویش لە زیندوو و، دەتوانێت شتی زۆرت پێببەخشێت.

سۆز و بەزەیی و بەخشندەیی خوای گەورەت بۆ بەندەکانی لەبیر بێت و، بێ هیوا مەبە لێی و، لە هەمان کاتدا بترسە لە سزای.. ئەمانە لە لایەك هاندەرێکن بۆت و، لە لایەکی تریشەوە ڕێکخەرێکیشن بۆت.

## پەیوەندی پاڕانەوە بە ئەرێنیبوونەوە:

موسوڵمان کاتێك کە لە خوا دەپاڕێتەوە و پەنای بۆ دەبات و داوای هاوکاریی لێدەکات.. دەبێتە کەسێکی ئەرێنیی؛ چونکە دوعا و پاڕانەوە واتە نائومێدنەبوون لە ڕەحم و سۆزی خوا، پاڕانەوە واتە ئاواتخواستن لە خوای پەروەردگار.

ئەمەش وەکو کەسێك وایە کە کەوتبێتە ناو بیرێکەوە و خەڵکانێکیش لەسەرەوە لای ئەو بیرەوە تێبپەڕن، خۆ دەبێت داوای یارمەتییان لێبکات هەتا بێن و ڕزگاری بکەن، ئەگەر هاتوو داوای یارمەتییان لێ نەکات ئەوا بە کەسێکی ئەرێنیی لە قەڵەم نادرێت.

ئیتر بۆچی ئێمە لە خوا نەپاڕێینەوە لەکاتێکدا کە جڵەوی ئاسمانەکان و زەوی و، هەرچی هەیە بە دەستی ئەوە.

جا کاتێك کە ئێمە لە خوا دەپاڕێینەوە دەبینە کەسێکی ئەرێنیی، چونکە داوای یارمەتیمان لە باشترین و بەدەسەڵاتترین کەس کردووە.

پێغەمبەرمان (دروودی خوای لەسەر بێت) لە خوای گەورە دەپاڕایەوە و پەنای پێ دەگرت لە خەم و پەژارە و، تەمبەڵی و تەوەزەلی و، ترسنۆکی و چاوبرسێتی و، لە قەرز و قۆڵە و ستەم و زۆرداریی زۆرداران.

گەر بە وردی سەرنجی ئەم شتانە بدەین، ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە هۆکاری سەرەکی دروستبوونی خەم و پەژارە و نیگەرانیی مرۆڤن و، سەرچاوەی نوشوستییەکانن، هەروەها فێری ئەوە دەبین کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لە خوا پاڕاوەتەوە و پەنای پێگرتووە و، ئێمەش فێری پەناگرتن بە خوای گەورە دەکات.

موسوڵمان کاتێك کە لە خوای گەورە دەپاڕێتەوە، هەست بە خۆشی و ئاسوودەییەك دەکات لە دڵ و دەروونیدا و، وا هەست دەکات کە لە ڕووبەڕووبوونەوەی کێشەکاندا خۆی تەنها نییە و پشتیوانێکی گەورەی لەپشتە.

## گرتنەبەری هۆیەکان:

گرتنەبەری هۆیەکان بۆ ئەوەیە کە هەرچییەکمان پێ دەکرێت بۆ هەر کارێکی باش، هەوڵی بۆ بدەین و درێغی نەکەین، تاوەکو شت فێرببین و ڕابێین و ئامادەی هەموو کارێکی پێویست بین لەو بارەیەوە، وەك خوای گەورە لەبارەی (ذي القرنين)ەوە دەفەرموێت:
﴿إِنَّا مَكَّنَّا لَهُ فِي الْأَرْضِ وَآتَيْنَاهُ مِن كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا * فَأَتْبَعَ سَبَبًا﴾
الكهف:٨٤-٨٥، واتە: (بەڕاستی ئێمە دەسەڵات و هێزمان پێ دابوو لە زەوییدا و، هەرچی بویستایە بۆمان دەسازاند. ئەوەبوو ویستی بگاتە ڕۆژئاوا، ئێمەیش هۆمان بۆ ئامادە کرد و، ئەویش دوای هۆیەکە کەوت و بەرەو ڕۆژئاوا ڕۆیشت) .

بێ ئاگاییمان لە ئاکامی کارەکان ناچارمان دەکات بەو بەشە ڕازی بین کە خوا بۆی بڕیوینەتەوە، ئێمە کەمبین و کورتبینین و، تەنیا دیوێکی وێنەکە دەبینین، هەر ئەم ساتەی کە ئێستا ئێمە تێیداین، ملیۆنەها ڕووداو لە جیهاندا ڕوو دەدەن، کە هەندێکیان

پەیوەندییان بە یەکترییەوە هەیە و هەندێکی تریشیان جودان، تەنانەت ئەو ڕووداوانەشی کە پەیوەندییان بە یەکەوە هەیە ئێمە تەنها کەمێکیان دەبینین، هەر بۆیە ئێمە هەوڵی خۆمان دەدەین و ڕەنج و ماندووبوونی زۆر دەکێشین، کەچی ئاکامەکان نادیارن.. ئەوەی لەسەر ئێمەیە هۆیەکان بگرینەبەر و ئەنجامەکان بۆ خوای گەورە جێبهێڵین.

ئەگەر هاتوو ئەنجامەکانیش بە دڵی ئێمە نەبوون، ئەوا پێویستە بەو کەموکوڕییانەدا بچینەوە کە لە هۆیەکاندا دروستبوون، چونکە دەشێت وەك پێویست هۆیەکانمان نەگرتبێتەبەر، بەڵام هەر دەبێت قبوڵی بکەین، چونکە ئەوەی کە لەسەر ئێمە بوو کردمان، خوای گەورەش ئەوەی بۆ بڕیاردابن، بۆیە دەبێت پێی ڕازی بین و بیدەینە دەست خوای گەورە.

دەقەکانی قورئانیش بە ڕوونی باسیان لەوە کردووە:

﴿وَعَسَى أَن تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ﴾ البقرة: ٢١٦، واتە: (لەوانەیە شتێکتان پێ خۆش بێت، کەچی زیانتانی تێدا بێت).

﴿فَعَسَى أَن تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا﴾ النساء: ١٩، واتە: (زۆر نزیکە ئێوە شتێکتان بەدڵ نەبێت و حەزی لێ نەکەن کەچی خودا بیکاتە هۆی خێرێکی زۆر بۆتان).

مەرج نییە ڕووکەشی شتەکان لە ناوەڕۆکەکەیان بچێت و، مەرجیش نییە ناوەڕۆکەکەیان لە ڕووکەشەکەیان بچێت، جاری وایە مرۆڤ شتێکی زۆر بەلاوە گەورە و پیرۆزە، بەڵام وا دەرناچێت.

لــەم بارەیــەوە باســی چــیرۆکێك دەکرێــت، منــیش بۆتــانی دەگێڕمەوە:

دەگێڕنەوە پیاوێك ئەسپێکی هــەبوو زەویــی پێــدەکێڵا و، تاقانــە کوڕێکیشــی هــەبوو کــە لــە کێڵانــی زەوییەکــەدا هاوکــاریی دەکــرد، ڕۆژێکیــان ئەســپەکە هــەڵهات و ڕایکــرد لــە دەســتی، زۆر بــە دوای ئەسپەکەدا گەڕا بەڵام نەیدۆزییەوە، دراوسێکانی ئەو پیاوە هاتنــە لای و پێیــان وت: ئــەوە چ بــەڵا و موســیبەتێك بــوو تووشــت هــات، ئــەو ئەسپەی کــە زەوییەکــەت پێــدەکێڵا هــەڵهات، ئێمــەش ئێســتا نــازانین چیت بۆ بکەین؟ وتی: خــوا دەزانێــت چ خێرێکــی تێدایــە کــە منــیش و ئێوەش پێی نــازانین، ڕەنگــە قســەکەی ئێــوەش ڕاســت بێــت و، ئەمــە بەڵایەك بووبێت تووشم هاتبێت، لەوانەشە خوای گەورە هەڵهاتنی ئــەم ئەسپە بەخێر بگێڕێت.. پاش سێ مانگ وەختێکی زانــی ئەســپەکە بــە خۆی و ژمارەیەك ئەســپ و مــاینی دەشــتەکی کــە هــۆگری بووبــوون و سەرکردایەتی دەکردن گەڕایەوە بۆ لای، کە دیار بوو دواجار نیشــتمان و زێدی خۆی بیرکەوتبووەوە، بۆیە بەهۆی گەڕانەوەی ئەو ئەسپانەش لەگەڵی هاتبوون.

دراوســێکانی هاتنــەوە و وتیــان: ماشــاء الله چ بــەختێکت هەیــە! ئەسپێکت لە کیس چوو کەچی ئێستا بیست دانەت هەیە، وتــی: ئێــوە وا دەڵێن، بەڵام ڕەنگە ئەمە خێرێکی تێدا بێت و، ڕەنگە واش نەبێت.. ئەوان بەو قسانەی سەریان ســووڕما، کەســێك ئەســپێکی هــەبووبێت و

ئێستا بیست ئەسپی هەبێت، ئایا ئەوە خێر و بەرەکەت نییە بەسەریدا ڕژاوە؟! پاشان ئەم پیاوە بە هاوکاریی کوڕەکەی دەستیکرد بە ڕاهێنانی ئەو ئەسپانە، ڕۆژێك لە ڕۆژان کاتێك کە کوڕەکەی خەریکی ئیشوکار بوو لە کایەنەکەدا ئەسپێکیان جووتەیەکی بۆ وەشاند و دەستێکی شکاند، دیسان خەڵکەکە هاتنەوە بۆ لای و وتیان: سبحان الله! هەر ئەو تاقە کوڕەت هەبوو یارمەتیت بدات، ئەویش وا کۆڵەوارە، ئای! چەند داماویت، باشە لەمەودوا چۆن زەوییەکەت دەکێڵیت؟ ئەی چۆن کشتوکاڵ دەکەیت؟ وتی: ئێوە وا دەڵێن، بەڵام لەوانەیە خوای گەورە شکاوی دەستی کوڕەکەم بەخێرێك بگێڕێت کە ئێوە نایزانن؟ دیسان بڕوا و قەناعەتیان بە قسەکانی نەبوو.

دوای مانگێك ئەو وڵاتە بە ناهەق و ستەمکارانە شەڕێکی لە دژی دەوڵەتێکی تر هەڵگیرساند و، بڕیاری بەزۆر سەربازیکردن بۆ لاوانی وڵات دەرچوو و، چی گەنج هەبوون کە لە تەمەنی ئەو گەنجەدا بوون ڕاپێچی ئەو جەنگەیان کردن، هاتن ئەم گەنجەش بەرن، کە تەماشایان کرد دەستی شکاوە، وتیان: ئەمە بۆ شەڕکردن ناشێت.

ئەوەبوو ئەو وڵاتە جەنگەکەی دۆڕاند و، زۆربەی ئەو گەنجانەشی چووبوونە ئەو جەنگەوە کوژران، دیسان خەڵکەکە هاتن بۆ لای و وتیان: بەخوا تۆ شانست هەیە! کوڕانی ئێمە هەر هەموویان کوژران و کوڕەکەی تۆش لە ژیاندا ماوە.

زۆربەی خەڵکی ئاوا تەماشای شتی نزیك دەکەن و ئەو دیوی شتەکان ناخوێننەوە، هەروەها ئێمەش ئاکامی شتەکان نابینین، تەنیا بەشێکی وێنەکە دەبینین، بۆیە پێویستە خۆمان بدەینە دەستی خوا و ڕازی بین بە بەشی ئەو، هەر کاتێکیش هەستمانکرد کە شتێکمان لەکیس چووە، ئەوا داوای یارمەتی لە خوا دەکەین.

## ئامانج ڕوونیی:

گەورەترین هیوا و ئاوات لەم ژیانەدا بیخوازین، ئەوەیە کە خوای گەورە لێمان ڕازی بێت، هەر کاتێك ڕەزامەندی خوامان بەدەستهێنا ئیتر ئەوە گرنگترین شتە کە ئاواتی پێ بخوازین.

گومانی تێدا نییە کە مرۆڤ دەکەوێتە هەڵەوە و شتی بیر دەچێتەوە، بەڵام پێویستە لەسەرمان کە بە ئامانجگرتنی ڕەزامەندی خوا و بەدەستهێنانی بکەینە پاڵنەرێك بۆ کارکردن و لە هەمان کاتیشدا ڕێکخەرێك بۆ ژیان، واتە تا بۆمان دەکرێت لەو شتانە دوور بکەوینەوە کە لەو ئامانجە نزیکمان ناخەنەوە، لە هەمان کاتیشدا فێری ئەو شتانە ببین کە لەو ئامانجە نزیکمان دەکەنەوە.

من پێم وایە لەم ڕووەوە تووشی قەیرانێکی گەورە بووینەتەوە، کە پێویستە بابەتی نیەتپاکی و، بوونی ئامانجێکی ڕوون و، ڕێکخستنی ژیانمان بەو ئامانجە لەیاد نەچێت.

**فەرامۆشكردنی ئامانجە گەورەكان:**

ئـەو جیهانگەرایـیـەی كـە سەرتاسـەری جیهـانی گرتووەتـەوە زۆر شتی خراپی لێكەوتووەتەوە، ناشڵێم: هەموو جیهانگەرایـیـەك خـراپ و بێكەڵكـە، بــەڵام زۆربــەی خراپــە، گرفتەكــەش لەوەدایــە ئێســتا جیهانگەرایی، خەڵكی بـە وردەكارییـەكانی ژیـان و جوانكارییەكانـەوە سـەرقاڵكردووەو، بنــەما و پــەیڕەو و ئامانجــە گــەورەكانی لــەبیر بردوونەتەوە.

بێگومان مرۆڤ تا پێشبكەوێت زیاتر بایەخ بـە وردەكـاریی دەدات، بەڵام چەندەش پەیوەست بێت بـە لادێـوە، بـەهۆی سـەرقاڵییەوە بـە ئیشوكارەوە گوێ بە وردەكارییـەكان نـادات و، بـە شـتە گشـتییەكان ڕازی دەبێت.

بەڵام لە ڕوانگە و دیدگای ئیسلامییەوە: پێویستە وردەكارییەكان لە چوارچێوەی شتە گشتییەكاندا دەرنەچن، واتـە كاتێـك كـە گرنگـی دەدەیـت بــە وردەكارییــەكانی ژیانــت، دەبێــت گرنگیدانەكــەت بــەو وردەكارییانە لە چوارچێوەی پارێزكـاریی و لەخواترسـان و، كـاركردن بۆ ڕۆژی دوایـی و، سـوودی خـوا و خـاك و خـەڵك و، هـەڵگرتنی زیـان لەسەر موسوڵمانان و.. نەچێتە دەرەوە، پێویستە لەم چوارچێوەیەدا بایەخ بە وردەكارییەكان بدەین.

مەترسیدارترین شتێك كە جیهانگەرایی پێی هەڵدەستێت، ئەوەیە كە گرنگی بە وردەكارییەكان بدەین و كارە سەرەكییەكان فەرامۆش بكەین.

ئەگەریش بمانەوێت لە كاریگەریی جیهانگەرایی بەسەر خەڵكەوە بكۆڵینەوە، دەبا سەیرێكی باس و خواس و گفتوگۆی كۆڕ و كۆبوونەوەكان بكەین.. بزانین ئەو خەڵكە سەرگەرمی چ باسێكن؟

سەریان ناوەتە یەك و باس باسی ماڵ و ناوماڵ و ئۆتۆمبێل و، بەزم و ڕەزمی دونیا و چی و چییە. دەگونجێت ئەوانە كەسانێكی نوێژكەر و ڕۆژووگر و بۆ خوا سوڵحاویش بن، بەڵام خەمەكە بەشێوەیەكی تەواوەتی یان نیمچە تەواوەتی ڕووی لە وردەكارییەكانی دونیا و دەستكەوتە هەنووكەییەكانە و، پرسی چارەنووسی هەتا هەتایی مرۆڤ و چارەنووسی نەتەوەی ئیسلامی فەرامۆش كراوە.. بەردەوام گفتوگۆكانمان لە پرسە بچووكەكاندا قەتیس كردووە و، پرسە گەورەكانیشمان كردووەتە قوربانیان.



## تایبەتمەندییە هزرییەكانی موسوڵمانی ئەرێنیی:

مرۆڤە ئەرێنییەكان لە سەرتاسەری جیهاندا خاڵی هاوبەش لە نێوانیاندا بەدی دەكرێت، جا ئەگەر بمانەوێت بڵێین: فلانە كەس تێگەیشتووە و ئاستی بیر و هزری بەرزە، كەوابوو هەر كەسێك شیاوی

ئەوە بێت کە پێی بڵێین کەسێکی تێگەیشتووە و بیر و هزری لە ئاستێکی بەرزدایە، هۆکەی بۆ ئەو بنەما و تایبەتمەندیی و خاڵە هاوبەشانە دەگەڕێتەوە کە هاوچەشنەکانی هەیانە و پێکەوە کۆیکردوونەتەوە؛ موسوڵمان بێت یان ناموسوڵمان.

بێگومانیش موسوڵمان وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا چەند تایبەتمەندییەکی خۆی هەیە، بەڵام لەسەر ئاستی بیروباوەڕ و هزر چەندین خاڵی هاوبەش لەنێوان خەڵکدا هەیە، کە بە بیر و بنەما و تایبەتمەندیی سەرەکی دەژمێردرێن، هەرکەسێك بیەوێت کەسێکی ئەرێنیی لێدەربچێت پێویستە دەستیان پێوە بگرێت.

بەر لەوەی کە باسی ئەو بیروباوەڕ و بنەما و تایبەتمەندییە سەرەکییانە بکەم، دەمەوێت ئاماژە بدەم بەوەی کە ئەرێنیبوون ئەوە ناگەیەنێت کە بیروباوەڕ و بنەماگەلێکمان لەلا گەڵاڵە ببێت، هەرکاتێکیش بیروباوەڕ و بنەمامان لەلا گەڵاڵە بوو ئیتر تەواو دەبینە کەسێکی ئەرێنیی، بەڵکو ئەرێنیبوون ئەو کاتە دێتە دی کە چاکی مەردایەتی بۆ بکەین بەلادا و دەست بە گۆڕینی ژیانمان بکەین و، بە پشت بەستن بەو بیروباوەڕانەی کە هەمانە هەوڵی وەرگرتن و فێربوونی خووڕەوشت و ڕەفتارگەلێکی نوێ بدەین.

پێویستە ئەو هزر و بیر و بۆچوونانەی هەمانە بیانکەینە بناغەیەك بۆ گۆڕینی ڕەفتارمان، چونکە کە گۆڕانکاریی لە هەڵسوکەوت و ڕەفتارماندا ڕوویدا، بێگومان سوودی گەورەی لێدەکەوێتەوە بۆمان.

**یەکـەم تایبەتمەنـدیی هزریـی: کێشـەکە کێشـەی ویسـت و ئیرادەیە.**

یەکێك لەو تایبەتمەندییە هزرییانەی کە دەبێت لە کەسی ئەرێنیدا هەبێت: ئەوەیە کە پێی وابێت کێشەکە کێشەی ویست و ئیرادەیە نەك کێشەی توانا و دەسەڵات.

ئەوەش خاڵی گرنگە دەبێت زۆر ئاگامان لێی بێت، دیارە کە ئێمە دوو شتمان لەبـەر دەسـتدایە: توانـا و دەسـەڵات و، ویسـت و ئـیرادە. خەڵك بەگشتی ـ بەتایبەتیش کەسی نەرێنیی ـ هەرگیز ناڵێت: (ویسـت و ئیرادەم لاوازە)، بەڵکو دەڵێت: (توانا و دەسەڵاتم کەمە) جـا کاتێـك کە چاوی بە بازرگانێکی سەرکەوتوو دەکـەوێت دەڵێـت: (فلانـە کـەس بەهۆی یارمەتی باوکییەوە لە بازرگانییەکەیدا سەرکەوتوو بـوو، بـەڵام من هیچ شتێکم نییە و، باوکم دنیایەك قـەرزی بەکۆڵمـەوە داوە، بۆیـە توانای من وەك توانای فلانە کەس نییە)!

هەروەها قوتابیش کـە دەرناچـێت دەڵێـت: (فلانەکـەس بەیەکـەم دەرچوو چونکە زۆر زیرەکە، بەڵام من ئەو زیرەکییەم لەکوێ بوو)!

تەماشا دەکەیت خێرا شتەکان دەبەسـتینەوە بـە توانـاوە، بـەڵام بەلای منەوە پێچەوانەکەی ڕاستە، من پێم وایە: کێشەی سـەرەکی لـە نێوان کەسێك و یەکێکی تردا خۆی لە توانـا و دەسـەڵاتدا نابینێتـەوە، بەڵکو خۆی لە ویست و ئیرادەدا دەبینێتەوە.

ئەگەر بە نموونە باسی دوو خوێندکار بکەین لە یەك پۆلدا، هەردووکیان زیرەکییان مامناوەند بێت، بەڵام یەکێکیان ئامادەیە ڕۆژانە چوار کاتژمێر خەریکی کۆششکردن بێت، ئەویتریشیان ئامادە نییە بۆ ماوەی نیو کاتژمێریش دابنیشێت کۆشش بکات، لە کاتێکدا هەردووکیان دەتوانن ئەو کارە بکەن، سەرەنجام ئەو کەسەیان کە کاتێکی زۆر بە کۆششکردنەوە بەسەر دەبات بە یەکەم دەردەچێت و، ئەو کەسەشیان کە کۆشش ناکات و گوێی لێ نییە دەرناچێت.

جیاوازی لە نێوان ئەو کەسەی کە بە یەکەم دەرچوو و ئەوەی کە دەرنەچوو لە تواناد‌ا نەبوو، خۆ هەردووکیان توانایان هەبوو، بەڵکو کێشەکە لە ئامادەیی و ویست و ئیرادەدا بوو، ئەمیان ئامادەیی تێدا بوو لێببڕێت و، ئەویان ئامادەیی لێبڕانی نەبوو.

ئێمەش هەمیشە ئامادەین بڵێین: من ناتوانم.

کە ڕاست وایە بڵێین: من نامەوێت.

ئێمە پەردەپۆشی ڕاستییەکان دەکەین گوایە ناتوانین، کە لە ڕاستیدا وانییە، بەڵکو ئێمە دەتوانین بەڵام نامانەوێت. خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ أَرَادُوا الْخُرُوجَ لَأَعَدُّوا لَهُ عُدَّةً﴾ التوبة: ٤٦

واتە: (ئەگەر ئەو ئیزن خوازانە بیانویستایە دەرچن بۆ جیهاد ئەسبابی دەرچوونیان ئامادە دەکرد و خۆیان کۆدەکردەوە).

کاتێك کە ئامادەیی و ئیرادە بوونی هەبێت، ئیدی مانای وایە هۆیەکان دەگرینەبەر، بۆیە کاتێك کە کەسێك پێمان دەڵێت: من حەزم لە سەرکەوتنە و دەمەوێت سەرکەوتن بەدەست بهێنم.

پێویستە لێی بپرسین: تۆ دەتەوێت سەرکەوتن بەدەست بهێنیت؟

جا کە دەڵێت: بەڵێ. پێویستە پێی بڵێین: ئەی چ هەوڵێکت بۆ داوە؟

جا ئەگەر زانیمان هیچ هەوڵێکی بۆ نەداوە، ئەوە بزانە کە ئەو سەرکەوتنی ناوێت.

مرۆڤی ئەرێنیی پێی وایە: کێشەی سەرەکیی لە ژیانیدا لە کەمتواناییدا نییە بەڵکو لە کەمویستیدایە.

بەلام مرۆڤی نەرێنیی بەپێچەوانەوەیە، ئەو هەمیشە دەڵێت: من دەمەوێت، من سوورم، من تێدەکۆشم، من هۆیەکانم گرتەبەر بەلام دۆخی نالەبار رێی پێنەدام، یان: فلانە کەس نەیهێشت، یان دەڵێت: دەسەلاتم هەر ئەوەندەیە.

بەلام ئەوە ڕاست نییە، ئەگەر ورد ببیتەوە بۆت دەردەکەوێت کە نایەوێت، بەڵگەش بۆ ئەوەی کە نایەوێت ئەوەیە کە خۆی ئامادە نەکردووە و، هۆیەکانی نەگرتووەتە بەر و، نەچووە بەدەم ئەو شتانەی کە بۆ سەرکەوتن پێویستن.

ویست و ئیراده تواناکان دەردەخات، هەر یەکەمان بە بەردەوامی توانای کردنی شتێکمان هەیە، جا ئەو شتە کارێك بێت یان چاککردنەوەی شتێك بێت یان..، ئەگەر ئەو ویست و ئیرادەیە لە ئارادا نەبێت، ئەوا ئەو توانایە دەرناکەوێت.

بۆیە ئاشکراکردن و دەرخستنی ئەو توانایانە پێویستی بە ویست و ئیرادەیە، هەرکاتێکیش ئیرادە هاتە کایەوە ئەوسا تواناکانیش دەردەکەون، هەر کاتێکیش ویست و ئیرادە و ئامادەیی لە ئارادا نەبوو، تواناکانمان بە شاراوەیی دەمێننەوە و ئاشکرا نابن.

**دووەم تایبەتمەندیی هزریی: کەمتەرخەمی خودی کەسەکە بنج و بنەوانی کێشەکەیە.**

لەو بیروباوەڕانەی کە لەسەر کەسی ئەرێنیی پێویستە هەیبێت، ئەوەیە کە بڵێت:

کەمتەرخەمی خۆم خودی کێشەکەیە، بەو واتایەی: بۆ ئەوەی کە لە کارێکدا سەرکەوتن بە دەست بهێنیت، پێویستە تێبکۆشیت و هەوڵی خۆتی بۆ بخەیتە گەڕ.

جا کاتێك کەسێك دووچاری کێشەگەلێك دەبێت و، دونیایەك کارەسات و بەڵای لێدەقەومێت، پێویستە بزانێت کە نە فڵانە کەس و نە ژینگەی نالەبار هۆکاری ئەو کێشانەن، چونکە لە هەمان ژینگەی دژوار و نالەباردا خەڵکی دیکە دەژین و لەگەڵ ئەوەشدا نەکەوتوونەتە

ئەو کێشەیەی کە تۆ تێی کەوتوویت، بەڵکو توانیویانە کۆسپەکان تێبپەڕێنن.

بۆیە کاتێک دان بەوەدا دەنێم کە بنەڕەتی کێشەکە لە کەمتەرخەمی خۆمەوە سەرچاوەی گرتووە و، خۆم خەمساردبووم لە ئیشوکارەکەمدا و، خۆمم بۆ ئامادەنەکردووە، یان هەوڵم نەداوە فێرببم، یان مەشق و ڕاهێنانم بۆی نەکردووە و، یان ئارامم نەگرت، یان پەلەم بوو و سنوورم شکاند، دیارە کە سنوورشکێنییش هۆی نیوەی ئەو کێشانەیە کە مرۆڤ بەدەستیانەوە دەناڵێنێت.. کە لەم سۆنگەیەوە بیر دەکەیتەوە، واتە پێت لەسەر ڕێگەی ڕاست داناوە.

ئەم قسانەشمان ناکۆک نین لەگەڵ ئەو قسانەی کە لەسەر پرسی عەقڵی ناوەکیی کردمانن، لەو ڕووەوەی کە وتمان نابێت خۆت لە قەرەی باسی نەرێنیی و خۆتاوانبارکردن بدەیت، بەڵام ئێمە ئێستا ئەوەتاین لە بواری ڕەخنەگرتندا، ئاماژەشم بەوە داوە کە پێویستە لە بواری هەڵسەنگاندن و ڕەخنەگرتن و لێپرسینەوەدا پەنجە بخەینە سەر کەموکوڕییەکان و، ڕەوا نییە کە شتە ئەرێنیی و نەرێنییەکان لەیەکتری ئاوەژوو بکەینەوە.

جا کاتێک کە کەسێک دووچاری کێشە و گیروگرفتێک دەبێت و، بەدەم چارەسەرکردنیەوە دەچێت، پێویستە بەو چاوەوە سەیری زۆربەی زۆری ئەو کێشانە بکات کە خەتای خۆی تێدایە.

بێگومان کێشەگەلێك هەن کە کەسانی دیکەی وەك دایك یان باوك یان دراوسێ دروستی دەکەن، ڕاستە ڕەنگە چەندین کەس و لایەن کێشەت بۆ دروست بکەن، بەڵام زۆربەی کات بنەڕەت و هۆی سەرەکی ئەو کێشانە لە کەسەکان خۆیانەوە سەرچاوە دەگرن ئەگەر بەوردی سەرنج بدەن، کە زۆرجار ناشتوانن لێی وردببنەوە، بەڵکو بە سەرپێیی لێی دەڕوانن.

بۆیە ئەو مامۆستایەی کە بەڕێوەبەرەکەی بە ستەمکار لە قەڵەم دەدات، لە کاتێکدا سێ لەسەر چواری مامۆستاکان لێی ڕازین و ئەوەی ئەو سکاڵایەتی لەدەستی ئەمان نکۆڵی لێدەکەن، مانای وایە هەڵە تێگەیشتنێك ڕوویداوە، پێدەچێت ئەو مامۆستایە زوو زوو دوابکەوێت، یان وانەکانی بە باشیی نەڵێتەوە، یان ڕەنگە کێشە و گرفتی دروستکردبێت، هەر بۆیە بەڕێوەبەر لە ئاستیدا دڵی رەق بووە و لێی تووڕە بووە، ئەویش ئەو تووڕەبوونەی بە ستەملێکردن لێکداوەتەوە.

کەواتە قسەکە لێرەدایە: بنەڕەتی کێشەکان لە کەمتەرخەمی و ناکارایی کەسەکە خۆیەوە سەرچاوەی گرتووە، ئەگەرچی هەندێك لە هۆکارەکان پەیوەندییان بە خودی کەسەکەشەوە نەبێت.

### سێیەم تایبەتمەندیی هزریی: زاڵبوون بەسەر خوددا.

ئەو جەنگە یەکلاکەرەوەی کە مرۆڤ لەژیانیدا بەرپای دەکات جەنگی حەز و ئارەزووەکانە و، سەرکەوتنیش بەسەر دەروون‌دا

باشـترین سـەرکەوتنە، کـە دەکرێـت نـاوی بنـێین: **زاڵبـوون بەسـەر خوددا.**

بۆیە سەرکەوتن و زاڵبوون بەسەر خوددا بـە لوتکـەی سـەرکەوتن دادەنرێت.

زۆربـەی ئـەو دۆڕان و شکستانەشـی کـە لـە ژیانـدا بەرچـاومان دەکـەون، گـەر بێتـو بـەوردی سـەرنجیان بـدەین ئـەوا دەبیـنین یـان شکسـتە بەرامبـەر حـەز و ئـارەزوو، یـان شکسـتە بەرامبـەر فێـڵ و تەڵەکـەی شـەیتان، کـە دواجـار شکسـتی بازرگـانی و کۆمەڵایـەتییان لێکەوتووەتەوە.

سەرکەوتن کاتێك دەستپێدەکات کـە بەسـەر خۆمـان و، حـەز و ئارەزوومان و، فێڵ و تەڵەکەی شەیتاندا زاڵببین.

ئێمە مـرۆڤین و هەمیشـە لـە هەڵکشـان و داکشـانداین، دەمێك دەدۆڕێین لـە شـتێکدا و، دەمێکیش لـە شـتێکی تـردا سـەردەکەوین، بـەڵام هـیچ نـەبێت خـۆ دەبێـت سـەرکەوتنەکانمان لـە شکسـتەکانمان زۆرتربن. لەدواتردا تیشکی زیاتر دەخەمە سەر ئەم خاڵە.

## چوارەم تایبەتمەندیی هزریی: پارە نابێتە ڕێگر.

پارە و سامان و باری ئابووریی، کۆسپی گەورە نین، پەندەکـەش دەڵێت: (سامان کەسی مـەرد ناخاتـەوە، بـەڵکو کەسـی مـەرد سـامان دەخاتەوە).

کەسی زۆرمان بینی کە لە شوێنی پڕ لە ناز و نیعمەتدا ژیانیان گوزەراند، بەڵام لە کۆتاییدا شکستیان خوارد و بەدەستی بەتاڵ گەڕانەوە.

لە هەمان کاتدا زۆر کەسی تر هەبوون بە کولەمەرگی و لەبار و گوزەرانێکی سەختدا ژیانیان بردەسەر، کەچی دوای چەند ساڵێك گەیشتنە لوتکە لە هەموو شتێکدا؛ چونکە لەوە تێگەیشتوون کە سەرمایەی سەرەکی شتەکانی دەوروپشتیان نییە، بەڵکو سەرمایەی سەرەکی خۆی و، ئەو بیروباوەڕ و هەست و سۆز و هیمەتبەرزیی و ئامانج و پلان و کەسایەتییەیە کە هەیەتی.. ئا ئەوەیە سەرمایە و هێزی ڕاستەقینە.

وەختێك کە مرۆڤ ئەم شتانەی دەبێت، ئەوسا نەبوونی و، کۆسپ و لەمپەرە ماددییە سەختەکان نابنە ڕێگر لەبەردەمیدا، بەڵکو بە پشتیوانی خوای گەورە و پاشان بەرزیی ورەی خۆی زاڵ دەبێت بەسەریاندا.

لە یەکەم جەنگی جیهانیدا ئەڵمانیا بەتەواوەتی خاپوور بوو، بەڵام ئەڵمانییەکان خاوەنی سیستمی هزریی و، سیستمی بەرهەمهێنان و، سیستمی دەروونیین، کە هێزی نەتەوەی لەسەر بەندە و، هیچ جەنگێك ناتوانێت لەناوی بەرێت، ئەم شتانە لە دڵ و دەروونی هاونیشتمانیانیدا بە زیندوویی مایەوە.

بۆیە دوازدە ساڵ لە پاش شکستە گەورەکەیان پێشانگەیەکیان بۆ بواری پیشەسازی وڵاتەکەیان کردەوە، بەڵێ لەبەر ڕووناکی مۆمدا توانییان سەرلەنوێ وڵاتی ئەڵمانیا بنیات بنێنەوە، ئەوەی ئەوان لەو ماوەیەدا کردیان نەتەوەگەلێك لە ماوەی بیست سەدەشدا بۆیان نەکراوە.

ئەمە هەمووی بەهۆی ئەوەوەیە کە بڕوایان وایە تۆی خاوەن هیممەتی بەرز و بیر و هۆش و گیان، کەسی سەرەکی و بنەڕەتیت و، کێشەکە لە ژینگە و دەوروبەردا نییە، ڕاستە ژینگە کاریگەریی هەیە، بەڵام کۆنترۆڵ دەکرێت.

گەلێك وڵات و نەتەوەی تر هەن نموونەی جوانیان پێشکەشکردووە، وەك ئەزموونی یابان و، ئەزموونی سەنگافورە و، ئەزموونی مالیزیا و تورکیا و.. هەمووشیان ئەزموونی جوان و دڵخۆشکەرن.

گەر لەسەر ئاستی تاکیش ڕابمێنین و لە ژیانی گەورە بازرگانان و لێدوانیان سەبارەت بە خۆیان وردببینەوە، هەیانە دەڵێت: (کاتێك کە تەمەنم دە ساڵان بوو، ئیشی حەماڵیم دەکرد و کەلوپەل و باری خەڵکیم بە پارەیەکی کەم دەگواستەوە) تەماشاکە چەند سادە و خاکین و بە بێ شەرمکردن ئەو ڕاستیانە دەدرکێنن و، باسی ساڵانی ڕەشوڕووتی و نەبوونی خۆیان دەکەن، بەڵام بەهۆی دەستپاکی و چوست و چالاکییانەوە و، بەهۆی متمانەکردنی خەڵك پێیانەوە،

پارەیـــان خرایـــە دەســـت و، ئێســـتاش ئـــەوان ســـامانێکی زۆریـــان خڕکردووەتەوە.

لەبەرامبەریشـدا خـەڵکانێك هـەن پـارە و سـامانێکی زۆریـان لـە باوانەوە بۆ بەجێ ماوە، بەڵام بـەهۆی تەخشـان و پەخشـانکردنییەوە ئێستا هیچیان بەدەستەوە نەماوە و مایەپووچ بوون، نموونەکان زۆرن و با هێندە بەس بێت.

## پێنجەم تایبەتمەندیی هزریی: خودناسی.

مرۆڤی ئەرێنیی هەمیشە هەوڵ دەدات خاڵی بەهێز و لاوازی خۆی بزانێت.

ئەو سەرگەرمی پرۆسـەی هوشـیارکردنەوەی خـودە، هەوڵـدەدات خودی خۆی بە باشی بناسێت.. جا گەر بمەوێت کارێك ئەنجام بـدەم، ئەو شتانە چین کە لە کەسـایەتی و نـەریت و خووڕەوشـت و ڕەفتـاری مندا هەن و لەکەداریان کردووە، ئەی ئەو کۆسپانە کامانەن کە ناهێڵن دەستم بە فلانە شتدا بگات، لە هـەمان کاتیشـدا ئـەو خاڵـە لاوازانـەی تیامدان چین؟

هـەردوو خـاڵی بـەهێز و لاوازی کەسـایەتی کەسـێکیش شـاراوە و نادیارن، جاری وا هەیە کەسێك بەهۆی زیرەکـی و بـەهرە و توانایـەوە شوێن و پلە و پایەیەکی بەدەستە، بەڵام لەبەر ئەوەی کـە تووڕەیـە و زوو هەڵدەچێت، تەماشا دەکـەیت خـەڵکی سـەری ناخـەنـە سـەر و بـە

ڕووکەش ڕێزی لێدەگرن، بەڵام لە نێوان خۆیاندا بە یەکتری دەڵێن: سەری مەخەرە سەر و مەیوروژێنە، چونکە زوو هەڵدەچێت.

ئەم سیفەتە (زوو هەڵچوون و تووڕەبوون) هۆکارێکی سەرەکییە بۆ ئەوەی کە ئەم کەسە، نەبێتە بەڕێوەبەرێکی گەورە لە کۆمپانیایەك یان لە دەزگایەکدا.

ڕەنگە کەسێکی دیکە توانا و زانیاریی لەو کەمتر بێت و، وەکو ئەویش بەشداریی خول و ڕاهێنانی نەکردبێت، بەڵام ئەو پۆستەی پێبدرێت، چونکە ئەو سیفەتەی تێدا نییە.

سیفەتی (خاکیبوون)ی مرۆڤ لە خاڵە بەهێزەکانە، چونکە مرۆڤی خاکی و خۆهەڵنەکێش کەسی گەورە و بەهێزتر لە خۆی لێ نزیك دەکاتەوە، ئەها ئێمە کەسانی خاکیمان چەند خۆش دەوێن و، چەند لێیان نزیك دەبینەوە و، تێکەڵییان دەکەین، لە کاتێکدا کە دەشزانین جاری وایە تواناکانیان لە توانای ئێمە کەمترن.

سیفەتی خۆبەکەمزانی و خاکیبوون خاوەنەکەی لەبەرچاوی خەڵکی بەرز دەکاتەوە و کۆمەڵێك دەستکەوت و هەلی بۆ دەرەخسێنێت، کە هەرگیز مرۆڤی لووتبەرز و خۆبەشتزان دەستی ناکەون.

جارێکیان هاوڕێیەکم ـ کە بەردەوام خولی ڕاهێنان دەکاتەوە ـ بۆی گێڕامەوە، دەڵێت:

ڕۆژێکیان لە کاتی وانەوتنەوەدا بە گەنجە بەشداربووەکانم وت: هەر یەکەتان خاڵێکی بەهێز و سەرکەوتوو یان تایبەتمەندییەکی کەسایەتی تێدایە، گەر هاتوو بیقۆزێتەوە ئەوا سوودی باشی لێدەبینێت، دەڵێت یەکێك لە ڕاهێنراوە بەشداربووەکان هەستا و پێی وتم: ئەو قسە زلانەت لە چییە، باشە خۆ وا ئێستا من لەبەردەمتدا وەستاوم و تۆیش فێرم دەکەیت و ڕامدەهێنیت، ئادەی پێم بڵێ: ئەو خاڵە بەهێز و سەرکەوتووە چییە کە لەمندا هەیە؟ دەڵێ منیش پێم وت: تۆ کەسێکی ڕووخۆش دیاریت، دەڵێ وتی: جا ڕووخۆشی بە من چی؟ دەمژیێنێت؟ ئایا بەهۆی ڕووخۆشیمەوە لە ژیاندا سەرکەوتوو دەبم؟

دەڵێ پێم گوت: بەڵێ، ئەم زەردەخەنە و ڕووخۆشییە لە پەیوەندییە گشتییەکاندا بەچاوێکی گرنگەوە تەماشا دەکرێت، تۆیش ئەگەر بخوێنیت و بخوێنیتەوە و خولی زیاتر ببینیت و خۆت ئامادە بکەیت، ڕۆژێك لە ڕۆژان دەتوانیت ببیتە بەڕێوەبەری پەیوەندییە گشتییەکانی کۆمپانیایەکی گەورە، دەڵێ وتی: جا شتی وا چۆن دەبێت؟ دەڵێ منیش پێم وت: ئەی بۆ نابێت.

ئەم پیاوە کە گەڕاوەتەوە بۆ ماڵەوە بە هاوسەرەکەی وتووە: فڵانە کەس پێم دەڵێت تۆ کەسێکی ڕووخۆشیت، ئایا ئەوە ڕاستە؟

هاوسەرەکەی پێی وتووە: بەڵێ ڕاستە و، بەهۆی ئەوەشەوەیە توانیومە ئارامبگرم و لەگەڵتدا درێژە بە ژیان بدەم.

ئینجا ئەم پیاوە بە هۆی قسەی ڕاهێنەرەکەوە بەشداریی لە چەندین خولدا کرد و ژمارەیەك کتێبی خوێندەوە و، توانی بڕوانامەی دبلۆم لە پەیوەندییە گشتییەکاندا بەدەست بهێنێت و، بەردەوام خەریکی پەرەدان بوو بەو بوارە لە کەسایەتی خۆیدا.

ڕاهێنەرەکە پێی گوتم: جارێکیان کاتژمێر یەکی شەو بوو زەنگی تەلەفونەکەم لێیدا، دە ساڵ بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێپەڕیبوو، دەرکەوت ئەو کەسە بوو، پێی گوتم: دەمەوێت مژدەیەکت پێبدەم؟ دەڵێ وتم: مژدەی چی؟ وتی: ئێستا بوومەتە بەڕێوەبەری پەیوەندییە گشتییەکانی کۆمپانیاکەم وەك چۆن تۆ پێشبینیت کردبوو!

پێویستە لەسەر هەر یەکەمان هەستێت بە پرۆسەیەکی ڕەخنەئامێز لە خودی خۆیدا و، بە تێڕوانینی خۆیدا و ئەوەشی کەسانی دیکە لەسەری هەیانە بچێتەوە.

ئێمە دەزانین ئەو کەسانەی کە بار و گوزەرانیان سەختە و لە ژینگەیەکی نەبوودا دەژین، کاریگەریی نەرێنیی لەسەر دەروونی خۆیان یان منداڵەکانیان جێدەهێڵێت.

ئەوەشی کە لە ماڵێکی خواپێداودا ژیان دەگوزەرێنێت، مەراییکەرێکی زۆر لە دەورووپشتی کۆدەبنەوە و، ستایشی زۆری بەر گوێ دەکەوێت و، بەو هۆیەشەوە هەستێکی نەرێنیی لا دروست دەبێت.

مامۆستایانیش هەر وان، مامۆستای وا هەیە ڕووی خۆش و گەشبینە و، دەزانێت چ شێوازێك دروستە بۆ وانەوتنەوە، بۆیە هەمیشە خەریکی دروستکردنی وێنەیەکی ئەرێنیی و جوانە لە مێشك و بیرکردنەوەی منداڵان و لاواندا دەربارەی خۆی، لە لایەکی تریشەوە مامۆستای وا هەیە قوتابیەکانی لەسەر ڕەشبینی پەروەردە دەکات و، وێنەیەکی نەرێنییان لەبارەی خۆیەوە لە لا دروست دەکات.

لەوانەیە وێنەی ئەرێنیی، بە هەمان شێوەی نەرێنییش، جۆرە زیادەڕەوییەکی تێدا بێت، بۆیە ناوبەناو دەبێت پێداچوونەوەی بەسەردا بکرێتەوە.

لەوانەیە مرۆڤ بە منداڵیی نازناوێکی دیاریکراوی ڕەشبینانەی درابێتە پاڵ یان خۆی دابێتییە پاڵ خۆی، کە لە دواییدا لێی بووە بە ڕاست و لە هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە، کە ڕەنگە خولیا و خاڵی بەهێزی زۆر تێدا بن و بەو هۆیەوە دەرنەکەوتبن.

لە سیفەتەکانی کەسانی گەشبین و ئەرێنیی ئەوەیە کە پێداچوونەوە بەو وێنانەدا دەکەن کە خۆیان بۆ خۆیانیان دروستکردووە یان خەڵکی دیکە بۆی دروستکردوون.

ئەوەی جێگەی داخە ئەوەیە کە ئێمە زۆر جار ڕەخنە دەگرین، بەڵام ڕەخنەگرتنەکە ئاڕاستەی دەرەوە کراوە، واتە کاتێك کە لە زۆر شتدا ڕەخنە دەگرین لە خۆمانی ناگرین، بەڵکو دژی کەسانی دیکە بەکاری دەهێنین، ڕەخنە لە گشت شتێك دەگرین لە خۆمان نەبێت،

چی دەبێت ئەگەر کەسێك دان بە هەڵەکانی خۆیدا بنێت و بۆ نموونە بەخۆی بڵێت: من گومانم بۆ ئەو شتە ئاوا بوو، کەچی واش دەرنەچوو، من پێم وابوو ئەو ڕەفتارە باش و ڕێکوپێکە کەچی بە تێپەڕبوونی کات بۆم دەرکەوت کە وا نییە.

ئێمە ڕەخنەلەخۆگرتنمان زۆر بەلاوە قورسە، ڕەنگە ئەو هەستەش لەوەوە هاتبێت کە ڕۆڵی ڕەخنەلەخۆگرتن وەکو ڕۆڵی بەردهەڵکۆڵەر وایە، جەرگ و هەناو و خودی خۆی هەڵدەکۆڵێت و، پەردە لەسەر هەڵەکانی هەڵدەماڵێت، ئەوەش دەروون ئازار دەدات.

توێژینەوەکان ئەوە پشتڕاست دەکەنەوە کە ئەو شوێنانەی خەڵکی نەخوێندەواریان زۆرە یان مۆرکی نەخوێندەواری بەسەریاندا زاڵە، ڕەخنەلەخۆگرتن و هەڵسەنگاندنی خودی خۆیان لەلا زۆر ئەستەمە و، ئامادەنین وێنەیەکی نوێ دەربارەی خۆیان بکێشن، یان وێنەیەکی کۆن لە مێشکی خۆیاندا بسڕنەوە.

بەڵام کاری ڕەخنەلەخۆگرتن لە شوێنە هۆشیار و تێگەیشتووەکاندا ئاساییە؛ بەهۆی بوونی پێوەرگەلێکی ڕوون و تاوتوێکراو کە لە پرۆسەی بەخۆداچوونەوەکەدا پشتیان پێدەبەسترێت.

**شەشەم تایبەتمەندیی هزریی: ئەوەی کە بەردەستە بیکە.**

لە ژیاندا گەلێك کاری سووك و ئاسان هەن و، بە پێچەوانەشەوە کارانێکی دژوار و چاوەڕوان نەکراو و ئەستەم هەن.

زۆر جـار بـەهۆی بـەرزفڕین و داوای شـتی چـاوەڕواننەکراوەوە، ئیشوکارە ساکار و ئاسانەکەی بەردەستمان لـە کیس دەچێت، جـا ئەگەر شتێکی ئاسانمان بۆ هەڵکەوت بـا لـە کیس خۆمـانی نـەدەین و بەکاری بهێنین و، بەهۆیەوە هەنگاوی گەورەتر بنێین و شـتی باشـتر بەدەست بهێنین.

دەسـتدانە کـاری ئاسـان و ئامـادە لـە کـاری ئەسـتەم و چـاوەڕواننەکراو نزیکمـان دەخاتـەوە، جـاری وا هەیـە شـتێکت لا ئەستەمە، بـەلام بـە هـۆی نەوینتـەوە لـەو کـارە خـۆش و ئاسـانەی بەردەستت، پاش ماوەیەك لەویش نزیك دەبیتەوە و ئەویشت لا خۆش و ئاسـان دەبێـت؛ چـونکە مـەحاڵیی و ئەسـتەمکاریی پلەیـەك نییـە بەتەنها بەڵکو چەندین پلەیە، مەبەستم لە ئەستەمکاریی ئاساییە نـەك عەقڵی.

بۆ نموونە کەسێك کە نە فێـری لێخـوڕینی ئۆتۆمبێـل و نـە فێـری مەلە بووبێت، دەی دیارە لێخوڕینی ئۆتۆمبێلی بەلاوە ئەستەمە، بەلام دوای هـەوڵ و خـولبینینی بـۆ مـاوەی مانگێـك ئـەم ئەسـتەمییەی لا دەبێتە ئاسایی، چونکە هەرچییەکی تـوانی کـردی و چـەند قۆنـاغێکی بڕی.. بە هەمان شێوە بۆ کەسێك کە نازانێت مەلە بکات.

کاری نووسینیش هـەر وایـە، مـرۆڤ لـە سـەرەتادا ناتوانێـت نـاوی خۆی بنووسێت، بەلام کاتێك کـە فێـری نووسـین و لێکدانی پیتـەکان دەبێت، ئیدی ئەو شتەی کە ئەستەمە ئاسان و خۆش دەبێت لەلای.

**کێشـەی سـەرەکی موسـوڵمانان ـ لەسـەر ئاسـتی نەتـەوەی ئیسلامی و، ئاستی کۆمەڵگە و، ئاستی تاك ـ پەیوەندی نییە بـە شتی مەحاڵ و ئەستەمەوە، یـان شـتێك کـە لـە توانـای ئێمـەدا نەبێت ئـەنجامی بـدەین، کێشـەکەمان لەگـەڵ ئـەو شـتەدایە کـە دەتوانین ئەنجامی بدەین و نایکەین، کێشـەکەمان لەگـەڵ کـاری گراندا نییە، بەڵکو لەگەڵ کاری ئاساندایە، کێشەی ئێمـە لەگـەڵ دووردا نییە، کێشەی ئێمە لەگەڵ نزیکدایە.**

هیـــوادارم وردببینـــەوە و، گۆڕانکـــاریی بەســـەر شـــێوازی بیرکردنەوەماندا بهێـنین، بـا لـەبری ئـەوەی کـە بـیر لـە شـتی گـران و ئەسـتەم و دوور بکەیـنـەوە، بـیر لـەو شـتە سـادە و ئاسـان و نزیکانـە بکەینەوە کە هەریەکەمان دەتوانێت بیکات بەڵام نایکات.

وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، خەڵکانێکی زۆر بەهۆی بەرزفڕییـەوە شتی سادە و ساکار لەدەست دەدەن.

بەڵکو هەندێك لە موسوڵمانان کەوتوونەتە هاوکێشەیەکی سووك و ڕیسواوە، ئەویش ئەوەیە: چی ئاسان و خۆشە نامانەوێت، واتە ئەگەر بە یەکێکمان وترا: تۆ دەتوانیت فلانە کار و فلانە شت و فلانـە پـڕۆژە ئەنجام بدەیت، دەتوانیت بـەو بـڕە پارەیـە کـار بکـەیت! لـە وەڵامـدا دەڵێت: یان ئەو ئیشەم بۆ دەبێت، یان هەر هیچ ناکەم!

هەرچی گونجاو و لەبارە نامانەوێت و ئەوەشی دەمانەوێت بەردەست نییە، بۆیە کە داخوازی شتێکی ئەستەم دەکەیت، واتە تۆ بەوەی بەردەستە ڕازی نیت و داوای شتێکی ئەستەم دەکەیت.

## ئەنجام چی ڕوودەدات؟

مۆڵەتێکی کراوەی بۆ پێش دێت، بێکارییەکی بەردەوامی تووش دەبێت، من خۆم گەنجانێکی زۆر دەناسم کە مەرجی تایبەتییان هەیە بۆ کارکردن، ئەگەر کارێکی دەست نەکەوت کە ئەو مەرجانەی تێدا بێت، گوێی لێ نییە ساڵێك یان دوان یان سیان یان چوار ساڵ و زیاتریش بە بێکاریی لە ماڵ دابنیشێت.

ئەوەش بەڕاستی هەڵەیەکی کوشندەیە دەرهەق بە خۆی ئەنجامی دەدات، باش وایە بڵێت:

من ئێستا بەدوای کارێکدا دەگەڕێم کە بەردەست بێت، تا کارێکی باشترم دەست دەکەوێت گوێم لێی نییە، بەم کارەی ئێستامەوە خۆم بۆ کاری باشتر ئامادە دەکەم، ئەمەیە ئەرێنیبوون، بەڵام ساڵانێکی زۆر بە بێکاریی پاڵی لێبداتەوە و چاوەڕێی ئیشێکی دوور بکات، ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە مرۆڤ دەرهەق بە خۆی ئەنجامی دەدات.

ئەوەش خاڵێکی زۆر گرنگە، پێم وایە هەمووومان پێویستمان بەم بیرۆکەیە هەیە، تاوەکو ڕۆژانە بەم کێشانەدا بچینەوە و بە خۆمان بڵێین: ئێستا چ شتێك لەبەردەستدایە کە بیکەم؟

دەبینین شتانێکی زۆر لەبەردەستدان و دەتوانین ئەنجامیان بدەین ئەگەر بمانەوێت، دەبا دەستهەڵگرین لە کاری گران و ئەستەم و پڕوکێنەر، کە بۆ تەواوکردنی بیست کەسی پێویست بێت، با واز لەوە بهێنین و، بزانین: چ شتێك لە بەردەستدایە و دەکرێت ئێستا ئەنجامی بدەین؟

جا کێ لەتواناییدایە بیست لاپەڕەی کتێبێك لەسەر یەك بخوێنێتەوە با دەستپێبکات، ئەوەشی دەتوانێت جوزئێك قورئان بخوێنێت با ئەنجامی بدات، ئەوەشی ئێستا دەتوانێت دوو ڕکات نوێژ بکات با بیانکات.

ئەو کەسەشی کە لەتوانایدایە منداڵەکەی لە شتێك ئاگادار بکاتەوە، یان لەبارەی بابەتێکەوە لەگەڵی بدوێت، ئەوا پێویستە ئەو کارە پشتگوێ نەخات.

شتانێکی زۆری گونجاو و هەڵکەوتوو و ئاسان لە بەردەستدان و پێشیان هەڵناستین، هەمیشە کێشە و گرفتی ئێمە لەگەڵ سانا و ئاساندایە، هەربۆیە مرۆڤی ئەرێنیی پێی وایە کێشە و گرفتی ڕاستەقینەی لەگەڵ ئاساندایە، نەك گران و ئەستەم.

مرۆڤی ئەرێنی بەپێچەوانەوەیە، هەرگیز لەبارەی ئاسان و گونجاوەکانەوە نادوێت و، باسی کەمتەرخەمی خۆی ناکات، ئەو شتانەش ناوروژێنێت کە دەبوایە بیکردنایە و نەیکردوون، ئەو باسی

ئەو شتانە ناکات، تەنیا باسی شتێك دەکات کە ئەستەم و گران بێت و دەست نەکەوێت، یان دەڵێت: ئەو کارە بە من ناکرێت.

ئا بەو شێوەیە، ڕێگەیەکی بۆ دەکەیتەوە، کەچی ئەو دایدەخات، ڕێگەچارەیەکی بۆ دەدۆزیتەوە، بەڵام ئەو کۆسپێك دەخاتە بەردەمی.

کەواتــە: خــاوەنی دڵ و گیــان و عــەقڵی ئــەرێنیی، دەیــەوێت پەیوەنـدی لەگـەڵ ئاسـان و گونجـاودا خـۆش بکـات نـەك ئەسـتەم و نەگونجاو.

## حەوتـــــەم تایبەتمەنـــدیی هزریـــــی: کـــۆنترۆڵکردنی سەرچاوەکان.

ئێستا هۆشیاریمان لەبارەی زۆر شتەوە لەلا پەیدابووە کە پێشـتر نەماندەزانی، ماوەی بیست ساڵێکە کـەوا زانیارییمـان لـەبارەی چـەند پرسێکەوە بۆ دروستبووە و گەلانی جیهان هۆشیار بوونەتەوە.

هەمیشە وا بیرمان دەکردەوە کە کێشەی سەرەکیی بۆ نـەبوونی سەرچاوە دەگەڕێتەوە، دەمـانوت: فڵانـە دەوڵـەت سەرچـاوەی هەیـە بۆیە دەوڵەمەندە، فڵانە دەوڵەتیش بۆیـە نـەدارە چـونکە سەرچـاوەی نییە، فڵانە کـەس لـە باوکییـەوە میراتێکـی زۆری بـۆ بـەجێماوە بۆیـە دەوڵەمەندە، فڵانە کەسیش هیچی لەباوکییەوە بـۆ نەماوەتـەوە بۆیـە دەستکورت و نەدارە.

ئێستا لە سەرانسەری جیهاندا خەڵکی بە جۆرێکی تر بیر دەکەنەوە و، دەڵێن: کێشەکە لە سەرچاوەکاندا نییە، کێشەکە لە کۆنترۆڵکردن و بەڕێوەبردنی ئەو سەرچاوانەدایە، بۆیە ئێستا کەسانی وات بەرچاو دەکەوێت کە سەرچاوەی کەمیان لەبەردەستدایە و توانایان سنووردارە، بەڵام زۆر بە نایابی بەڕێوەیان دەبەن، کەسانی واش هەن کە لە هیچیان کەم نییە، کەچی بە خراپی بەڕێوەی دەبەن، بۆیە ئێستا دەبینین لە هەندێ وڵاتدا مووچەی سەرۆکی کۆمپانیایەك لە مووچەی سەرۆك کۆمارێك زیاترە، وەك لە ئەمەریکادا بەرچاومان دەکەوێت.. ئەوان دەڵێن: ئایندەی ئەم کۆمپانیایە بە ژمارەی کارمەندەکانی و پارەی وەبەرهێنراویدا نەبەستراوەتەوە، ئایندەی ڕاستەقینەی بە بەڕێوەبردنیەوە بەستراوەتەوە، کەواتە چەندە پارە لە سەرپەرشتیکردن و بەڕێوەبردنیدا خەرج بکەیت هێشتا هەر کەمە.

جا ئەگەر سەرمایەی کۆمپانیایەك سەد ملیۆن بێت و، بەڕێوەبەرێك - هەرچەندە مووچەی ساڵانەی ملیۆنێك بێت - توانی ئەو کۆمپانیایە لە کۆمپانیایەکی شکستخواردووەوە بکاتە کۆمپانیایەکی سەرکەوتوو و قازانجکەر، ئەوە بەڕاستی کارێکی مەزنی ئەنجام داوە.

سەبارەت بە ژیانی تایبەتی خۆشمان هەر وایە، پێویستە ئەو زانیارییە لە مێشکماندا بچەسپێنین کە کێشەکە لە سەرچاوەکاندا نییە، بەڵکو لە چۆنیەتی بەڕێوەبردنی سەرچاوەکاندایە.

چۆن کاتەکانمان ڕێکدەخەین؟

چۆن بتوانین وزە و توانا جەستەیی و هزریی و دەروونیی و گیانییەکان بەڕێوەبەرین؟

چۆن بتوانین بیانقۆزینەوە و بەشێوەیەکی نموونەیی بیانخەینەگەڕ؟

چۆن بتوانین توانا داراییەکانمان بقۆزینەوە و بە باشیی بیانخەینەگەڕ؟

ئێستا ئەمە کێشەکەیە و، پرسیاری گرنگ ئەمەیە.

قسەیەکی هەڵە هەیە کە کەسی نەرێنیی و شکستخواردوو دەیکات، دەڵێت: (سەد هەزارم پێبدە، دوای ساڵێك دوو سەد هەزارت پێدەدەم..!) لەو وایە کێشەکە لە نەبوونی سەد هەزاردایە، ئەوە کێشە نییە، بەڵکو کێشەکە لەوەدایە کە چۆن سەرپەرشتی کاروبارەکان بکرێت.

ئێمە نکۆڵی لە ڕۆڵ و کاریگەریی بارودۆخ ناکەین، دەزانین کە جیاوازیی هەیە لە نێوان بەرهەم و دەستمایەی کەسێك کە لە ڕەوشێکی لەباردا کار دەکات و، بەرهەم و دەستمایەی کەسێکیش کە لە ڕەوشێکی نالەباردا کار دەکات؛ ئەوەی دواجار یەکلای دەکاتەوە چیە؟ ئایا هەوڵ و تەقەلای تاکە کەسییە یان بارودۆخەکەیە؟

ئەوەی یەکلایی دەکاتەوە هەوڵ و کۆششی تاکە کەسییە نەك بارودۆخ.

خەڵكانێك هەن بڕیاری بەندكردنیان بۆ چەند ساڵێك بۆ دەرچووە، هی وایان تێدایە كە بەر دەبێت بە تەواوی دەروونی تێكشكاوە و، پێویستی بە چەند ساڵێك ڕاهێنانەوە هەیە تاوەكو تێكەڵ بە كۆمەڵگە ببێتەوە.

كەسی واشیان تێدایە هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەركردووە و، فێری زانست و زانیاریی و پیشەی هەمەچەشن بووە، ڕەنگە تیاشیاندا بێت كە لە ژووری تاكە كەسیدا ژیابێت.

بەهەمان شێوە لە جیهانی پڕ لە قەیران و كۆمەڵگە دواكەوتووەكانیشدا كەسانێكی تێكشكاو دروستبوون و، لە هەمان كاتیشدا كەسانێكی ناوازە هەڵكەوتوون.

---

**مرۆڤی ئەرێنیی پێی وایە كە سەركەوتن پێویستی بە هەوڵ و تێكۆشانی بەردەوامە وەك لەوەی كە پێویستی بە ڕەوشێكی لەباربێت.**

---

سەركەوتن پێویستی بەمەیە و پێویستیشی بەوەیە، بەڵام كامیان پێویستترە؟

بێگومان ئەو لە چاو ڕەوشی لەباردا زۆر زیاتر پێویستی بە هەوڵ و تەقەلا و، ماندوونەناسی و، شەونخوونی و، ڕێكخستن و، ڕاهێنان و فێربوونی بەردەوام هەیە.

**هەشتەم تایبەتمەندیی هزریی: شکست هەنگاوێکە بەرەو سەرکەوتن.**

کەسی ئەرێنیی بەو چاوەوە سەیری شکست دەکات کە هەنگاوێکە بەرەو سەرکەوتن، چونکە مرۆڤ کاتێك کە شکستێکی بەسەردا دێت، بە ڕێگەیەکی داخراو ئاشنا دەبێت، بۆ گەیشتنیش بە ئامانجێك چەندین ڕێگەمان لەبەردەمدایە، زۆر جاریش بە ئاسانی لەیەکتریان جیاناکەینەوە تا نەیانگرینەبەر.

چۆن بزانین کە ئەم ڕێگەیە کورتترە لەو ڕێگەیە، ئەگەر جارێك پیایدا تێنەپەڕین و نەیپێوین.

مرۆڤی ئەرێنیی کاتێك کە هەوڵێك دەدات و ئەنجامەکەی بەخراپی دەشکێتەوە، هەڵوێستی چی دەبێت؟ ئەو دەڵێت: زۆر باشە، من ئێستا بۆم دەرکەوت کە ئەم ڕێگەیە ڕێگەیەکی داخراوە و بەکەڵکی فلانە شت نایەت، ئەمەش واتە جارێکی تر ئەو ڕێگەیە ناگرمەبەر، کەواتە سوودی لەوە وەرگرت.

تەنانەت مرۆڤی زۆر ئەرێنیی پێی وایە لە ژیاندا شتێك نییە ناوی شکست بێت، بەڵکو ئەوەی هەیە ئەنجامی خراپە، جا هەر کاتێك کارێکمان ئەنجامدا کە بەباشی ئامادەکاریمان بۆ نەکردبێت و، دڵسۆزیمان تێدا نەنواندبێت و، ئەنجامی خراپی لێکەوتبێتەوە، ئەوە شکستخواردن نییە، بەڵکو ئەوە ئەنجامی خراپی هەنگاوی نادروستە،

ئەگەر هەنگاوی ڕاست و دروست بنێین، ئەوسا ئەنجامی باشی لێدەکەوێتەوە.

جا لەبری ئەوەی کە خەم دایگرێت و بێهیوایی ڕووی تێبکات و بڵێت: (من بە کەڵکی هیچ نایەم) با بڵێت: (ئەم ئەنجامە ئاساییە؛ چونکە ئەو هەنگاوانەی کە نامانن هەنگاوی خراپ بوون، جا بۆیە ئەگەر دەمانەوێت ئەنجامی باش بەدەست بهێنین، ئەوا پێویستە هەنگاوی باشی بۆ بنێنین).

گەر لە ژیانی خەڵك ڕابمێنین، لەوانەیە کەسێکی بەتوانا و لێهاتوو بەهۆی بیرۆکەیەکی هەڵەوە بگۆڕدرێت بۆ کەسێکی نەرێنی و تێکشکاو و، ببێت بەبار بەسەر خەڵکییەوە، لە کاتێکدا دەیتوانی بەیەکێك لەو بیرۆکانەی ئاماژەمان پێدان چارەسەری بکات.. بۆیە زۆر جار بیرۆکەیەکی هەڵە قوڕ دەکات بەسەر کەسێکدا و، بەتەنها بیرۆکەیەکی باشیش گۆڕانکاریی بێ وێنە لە ژیانی کەسێکدا دروستدەکات.

بیرۆکە و تێگەیشتن و بیروباوەڕ کاریگەریی زۆر لەسەر ئامانجەکان بەجێدەهێڵن، لە کۆمەڵگە نەخوێندەوار و دواکەوتووەکانیشدا بە چاوێکی کەم سەیری بیروباوەڕ و تێگەیشتن دەکرێت، ڕەنگە پێمان وابێت کە بیروباوەڕ و تێگەیشتن کاریگەریی نییە..! ئەوەش هەڵەیە، چونکە بیروباوەڕ و تێگەیشتن کارتێکەرن و کار و چالاکی و ڕەفتارەکان ئاڕاستە دەکەن و، پەرچە کردارەکان ڕێکدەخەن، بەڵام ئەم کارە بە شاراوەیی ئەنجام دەدرێت.

## تایبەتمەندییە دەروونییەکانی کەسی ئەرێنیی:

کەسی ئەرێنیی کۆمەڵێك تایبەتمەندیی دەروونی هەیە، کە کەم تا زۆر پەیوەندییان بە تایبەتمەندییە هزرییەکانەوە هەیە، بۆیە جاری وایە وەك هەستێك گوزارشت لە شتێك دەکەیت، جاری واشە وەك بیرۆکەیەك گوزارشتی لێ دەکەیت.

**یەکەم تایبەتمەندیی دەروونی: خودناسی.**

مرۆڤی ئەرێنیی هەستدەکات بەشێوەیەکی بەردەوام ڕوو لە باشتر دەکات و، پێی وایە سەرکەوتنی بەسەر خودی خۆیدا بەدەستهێناوە بەهۆی ئەو کارانەی سەرکەوتووانە ئەنجامیان دەدات، وا هەستدەکات ئەمساڵی باشترە لە پارساڵ، ئەوەش شتێکی گرنگە، چونکە هەستکردن بە باشتر بوون ئەوە دەگەیەنێت کە بەسەر خودی خۆماندا زاڵبووین.

سەختترین سەرکەوتن ئەوەیە کە بەسەر خودی خۆتدا زاڵببیت، زاڵبوون بەسەر کەسێك یان سەد کەسێکدا زۆر ئاسانە، تەنانەت ئەو خوێندکارەی کە ڕێژەی ٤٠٪ی لەپۆلەکەیدا بەدەستهێناوە، کە دەبینێت ڕێژەی خوێندکارێکی تر ٣٠٪ە خۆی بە سەرکەوتوو دەزانێت، ئەمەش سووك و ئاسانە.

بەڵام سەرکەوتنی ڕاستەقینە ئەوەیە کە: هەست بکەم ئەمساڵ لە فلانە بابەت یان لە فلانە بواردا باشترم لە ساڵی ڕابردوو، وەك بواری پەرستش، یان بواری تێگەیشتن، یان بواری ڕەفتار و مامەڵەکردن، یان بواری هەڵسەنگاندنی شتەکان، یان دیدگاڕوونی، یان.. هەست بکەم کە لەم شتانەدا بەرەو پێشەوە دەچم و، ئەمساڵی کارم لە پارساڵی کارم باشتر بێت.

ئەمەش بەندە بە هەڵسەنگاندنی قۆناغی ڕابردوو و، هۆشیاریی تەواو و، پلانی تۆکمەوە.

ڕەنگە نەتوانێت بە بارودۆخی نوێی ئاشنا ببێت، مەگەر بەدڵ خەریکی پلاندانان بێت بۆی، بەوەی کە بزانێت چی دەوێت، بۆیە دەبینیت پاش ماوەیەك دەڵێت: ئەو شتەی کە دەمویست بەشێك یان هەموویم بەدەستهێناوە.

لێرەدا پرسی پلاندانانی کەسیی یان پلاندانان بۆ ژیانی تایبەتی خۆی سەرهەڵدەدات، کە بەڕاستی سەرچاوەی خێر و خۆشییەکی گەورە و، سەرچاوەی خودناسی و، سەرچاوەی ئاشنابوونی مرۆڤە بە تواناو شێوازەکانی ژیانی.

**دووەم تایبەتمەندیی دەروونی: ویست و ئیرادەیەکی بەهێز.**

مرۆڤی ئەرێنیی پێی وایە کە لاوازیی هەوڵ و هیممەتی، یەکێکە لە گەورەترین هۆیەکانی بێبەشبوونی لەو خێر و بێرەی کە هەیە، بەڵام مرۆڤی نەرێنیی هەرگیز خۆی تاوانبار ناکات و دان بە

خەمسـاردیی و لاوازیـی هـەوڵ و هیممەتیـدا نانێـت، بـەڵکو دەڵێـت: شکستەکەم بەهۆی بەڕێوەبەرەکەم، یان هاوسەرەکەمەوە بوو. !

کەسێکم دەناسی گرفت و ناکۆکی زۆر بوو لەگەڵ هاوسـەرەکەیدا و، هێشتا هەر لە خوێندن بـەردەوام بـوو، لـە ڕۆژانـی تاقیکردنەوەیـدا هاوسـەرەکەی گرفتـی بـۆ دروسـتدەکرد تـاوەکو دەرنەچـێت، ئـەو دەیویست تێکی بشـکێنێت، شـەڕێکی ڕاسـتەقینە لـە نێوانیانـدا بـەرپا بووبوو، ئەو شەڕەش لە بنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ شەڕی نێوان بـاوکی کچەکە و خەسووی، دواتر تەشەنەی سەندووە بۆ ناو ژیانی ئـەم ژن و مێردە.

پیاوەکە دەیگـوت: نـاپلیۆن وتوویـەتی: لـە پشـت هـەر پیـاوێکی مەزنەوە ئافرەتێکی مەزن هەیە، ئینجا دەستی دەخستە سـەر سـنگی و دەیوت: لـە پشـت هـەر نامەردێکیشـەوە ئـافرەتێکی نامـەرد هەیـە، بەدەسـت هاوسـەرەکەیەوە ئـاخی هەڵدەکێشـا و دەیگـوت: هەرچـیم بەسەر هاتووە بەهۆی هاوسەرەکەمەوە بووە. !

کەسی نەرێنیی پاساو بۆ گوفتار و ڕەفتارەکـانی دەهێنێتـەوە و، شتێکی هـەر بـۆ هەڵدەکـەوێت کـە سەرزەنشـتی لەسـەر بکـات، بـەڵام کەسـی ئـەرێنیی بەپێچـەوانەوە پێـی وایـە زۆربـەی گیروگرفتـەکانی و بێبەشبوونی لە شتی نایـاب و سـوودبەخش بـەهۆی هیممـەت نزمـی و لاوازیی ورەی خۆیەوە بووە.

هیممەتبەرزی و وورەبەرزیش پەیوەندییان بە ویست و ئیرادەوە هەیە، جا کاتێك کە ویست و ئیرادە بەهێز و تۆکمە دەبێت وزە و توانا لە مرۆڤدا بەرهەم دەهێنێت، هیممەت و وورەبەرزیی و هێز و تواناش ویست و ئیرادە بەرهەمی هێناون، لەبەر ئەوە لەو جەنگە سەرەکییانەی کە لە چوارچێوەی کەسایەتی خۆماندا بەرپای دەکەین، ئەوەیە کە: ویست و ئیرادەمان بەهێز بکەین، جا هەر کاتێك ویست و ئیرادەمان بەهێز بوو، ئەوسا هیممەت و وورەشمان بەرزدەبێتەوە.

باشترین شتیش بۆ بەهێزکردنی ویست و ئیرادە، بەربەرەکانیکردن و فشارخستنەسەر دەروونە، واتە مرۆڤ بەڵێنی بچووك بەسەر خۆیدا بسەپێنێت و هەوڵبدات پێیانەوە پابەند بێت، وەك ئەوەی پەیمان بدات ڕۆژانە جوزئێك لە قورئان بخوێنێت و، بەلایەنی کەمەوە نیو سەعات بۆ کتێب خوێندنەوە تەرخان بکات و، بەو شێوەیە، ئەم جۆرە شتانە گران نین و دوور و درێژیش نین، جا لە ڕێگەی پابەندبوونیەوە بەم بەڵێن و پەیمانانەوە هەست بەوە دەکات کە بووەتە خاوەنی ویست و ئیرادە، چونکە ئیشوکارێکی زۆری پێهەڵدەسووڕێت کە بە کەسانی دیکە هەڵناسووڕێت.

**سێیەم تایبەتمەندیی دەروونـی: بەختـەوەریی وابەسـتەی پارە و سامان نییە.**

کەسی ئەرێنیی هەست و بیروباوەڕێکی جوانی لەلا گەڵاڵـە بـووە، ئەویش ئەوەیە کە پێی وایە بەدەستهێنانی ئارامی و ئاسوودەیی دڵ و دەروون بە دەستکەوتنی پارە و پوولی زۆرەوە نەبەسـتراوەتەوە، خـۆ پێـوەرێکی وەهـا لـە ئـارادا نییـە هـەر کەسـێك پـارەی زیـاتری دەسـتبکەوێت بەختــەوەرتر و ئاسـوودەترە، مرۆڤـی ئـەرێنیی وا بـیر ناکاتەوە، بەڵکو پێی وایە پارە پێداویستییەکان دابین دەکات و، بـەڵا و تووشهاتی خراپ لە کۆڵ دەکاتەوە و، قەیرانەکان چارەسەر دەکات، بەڵام مەرج نییە هەر کـەس پـارە و سـامانی هـەبوو مانـای وایـە ئـیتر دڵخـۆش و بەختـەوەرە، مـەرجیش نییـە هـەر کـەس پـارە و سـامانی کەمی لەبەردەستدا بوو مانای وایـە ئـیتر بەدبـەخت و ماڵوێرانـە، ئـەم خاڵە بۆ لایـەنی دەروونیـی زۆر گـرنگ و کاریگـەرە، چـونکە دەروونـی مرۆڤ لە پارە تێر نابێت، جا ئەگەر هاتوو ئاسوودەیی و ئـارامیی دڵ و بەختـەوەریمان بەسـتەوە بـە دەسـتکەوتنی مـاڵ و دارایـی زۆرەوە، مانـای وایـە بەدرێـژایی ژیـان هـەر خـەریکی هەڵپـەکردن بـین و پشـوو نەدەین، کەچی هـەر دڵیشـمان خـۆش نـەبێت و وا بـزانین کـە ئـەوەی دەمانەوێت هێشتا هەر دەستمان نەکەوتووە.

**هــەر بۆیــە ئامۆژگــاریی خــەڵکی کــراوە و، وتــراوە: نەکـەیت بەختەوەریی بکەیتە ئامانجت.**

واتە: نەڵێیت ئەگەر بوومە خاوەنی ملیارێك ئیدی بەختەوەر دەبم، تۆ زۆر هەڵەیت و، خەیاڵ دەکەیت، بەڵکو هەر ئێستا بەختەوەر بژی و، هەمیشە وا بزانە کە دەتوانیت بە پارەیەکی کەم ئاسوودە و بەختەوەربیت بە مەرجێك شتانێکی دیکە پشتگوێ نەخەیت.. دڵنیاشبە گەر ئێستا دڵخۆش و ئاسوودە نەبیت، پارەیەکی زۆریشت دەستبکەوێت هەر دڵخۆش نابیت و هەست بە بێزاریی دەکەیت، بەڵگەکانیش لەو بارەیەوە لە ژیانی ڕۆژانەماندا هێندە زۆرن لە ژماردن نایەن.

## چوارەم تایبەتمەندیی دەروونی: هەستکردن بە بەرپرسیاریەتی.

هەستکردن بە بەرپرسیاریەتی لە لای مرۆڤی ئەرێنیی بەهێزە، بەڵام مرۆڤی نەرێنیی وا بیر دەکاتەوە کە نە هەڵەکان و نە ئاکامەکانیشی ناکەوێتە ئەستۆ و لێیان بەرپرسیار نییە.

تا تەمەنی مرۆڤ ڕوو لە هەڵکشان بێت، دووچاری هەر هەڵە و کەموکوڕییەك ببێت خۆی لێی بەرپرسیارە، ئەو مرۆڤەی کە تەمەنی دەگاتە پەنجا ساڵ بەرپرسیارە لە باری ئێستای خێزانداریی و، پەیوەندیی لەگەڵ منداڵەکانیدا و، پەیوەندیی لەگەڵ دراوسێکەی و، باری ئیشکردن و، بار و گوزەرانی ژیانی و.. چونکە ئەم بارەی ئێستا ئەوی تێدا دەژی دەرەنجامی کار و چالاکی ڕابردوویەتی، لە هەرەتی

لاویەتییدا چی چاندووە هەر ئەوە دەدورێتەوە، هەر بۆیە مرۆڤی ئەرێنیی چەند تەمەنی گەورە ببێت زیاتر بەرپرسیاریەتی ئەو بارەی کە تێیدا دەژی لە ئەستۆ دەگرێت، ئەو بارودۆخانەش باش بن یان خراپ، خۆی لێیان بەرپرسیارە.

بۆ ئەوەی کە زیادەڕۆیی نەکەم، باشترە کە بڵێم: بەرپرسیاریەتی زۆربەی ئەو ڕەوش و بارودۆخانەی کە ئێستا تیایاندا دەژی دەخاتە ئەستۆی خۆی.. بۆیە ئەو سەرزەنشتی کەسیان لەسەر ناکات و، بەرپرسیاریەتییان لە ئەستۆ دەگرێت و، بەدڵێکی فراوان و، بە عەقڵێکی کراوە و تێگەیشتووەوە ڕەفتاریان لەگەڵدا دەکات و، بە پێی توانا هەوڵی گۆڕین و پێشخستنیان دەدات.

هەستکردن بە بەرپرسیاریەتی لەبارەی شتێکەوە دەسپێکی ڕێگەی چاکسازییە، بۆیە تۆ ناتوانیت گۆڕانکاری بەسەر هیچ بارودۆخێکی تایبەت یان گشتیدا بهێنیت تاوەکو کەسانی بەرپرسی ئەو بارودۆخە دیاریی نەکەیت؛ چونکە کاتێك کە دەڵێیت: فلانە کەس بەرپرسیارە، ئەوسا دەتوانیت بارە ناهەموارەکە ڕابگریت، ئەگەریش بوار بڕەخسێت، ئەوا پێویستە لەخۆت بپرسیتەوە.. ئەم بارودۆخەی کە تێی کەوتووم، من لێی بەرپرسیارم، کەواتە دەبێت لە خۆم خۆش نەبم.

**پێنجەم تایبەتمەندیی دەروونی: هاوسەنگیکردن لە نێوان عەقڵ و دەرووندا.**

لە تایبەتمەندییەکانی مرۆڤی ئەرێنیی لە سەر ئاستی لایەنی دەروونیی ئەوەیە کە سازانێك بکات لە نێوان عەقڵ و دەرووندا.

دیدگا و بۆچوونەکانی عەقڵ ئاسۆی کار و چالاکی و پێشکەوتن بەرووماندا دەکەنەوە، بەڵام کێشەی عەقڵ و بیرکردنەوە لەوەدایە کە وا لە مرۆڤ دەکات خەیاڵپلاو بێت و، هیچی بەدڵ نەبێت.. نە لە خۆی رازی بێت و، نە لە کەسانی دی و ، نە لە حکومەتەکەی و، نە لە کۆمەڵگەکەی، تەنانەت لە مێژوویش رازی نییە..! بۆیە هەمیشە بێزارە، چونکە بە خەیاڵپلاوییەوە دەڕوانێتە شتەکانی دەوروبەری.

بەڵام پەروەردەی گیان و دەروون ئەو هەست و سۆزە دەروونییە وشك و ساردوسڕەی کە دیدگا و بیرکردنەوەی قووڵ هێناویەتییە کایەوە کەم دەکاتەوە.

بیرکردنەوەی قووڵ بە بێ بوونی پەروەردەیەکی دەروونیی و گیانیی، مرۆڤ هەناسە سارد و ڕەشبین دەکات.

هەر بۆیە ئەو بیرمەندانەی کە سەرنجی ئەم لایەنە نادەن و، هەوڵ بۆ ئەوە نادەن کە هەستە جوان و ئەرێنییەکانیان بە خۆراکی گیانیی و دەروونیی تێر بکەن، زۆربەی کات ڕەشبینیی زاڵە بەسەریاندا و، زۆر جار دووچاری ئەم کێشەیە دەبن، نە دڵیان بە کەس دەکرێتەوە و نە کەسیش دڵی پێیان دەکرێتەوە.

پێویسته ئەم گرفته بە پەروەردەیەکی جوانی دەروونیی و گیانیی چارەسەر بکەین؛ واته: بە گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە و پتەوکردنی پەیوەندی لەگەڵیدا و، پشتبەستن پێی و، داوای یارمەتیی لێکردنی.

کەواتە: مرۆڤی ئەرێنیی هەم ڕەچاوی پێداویستییەکانی عەقڵ و بیرکردنەوەی دەکات و هەمیش ڕەچاوی پێداویستییەکانی گیان و دەروونی دەکات و هاوسەنگییان لە نێواندا دەکات.

## شەشەم تایبەتمەندیی دەروونی: دەستکەوتەکان بەڕێکەوت پەیدانەبوون.

مرۆڤی ئەرێنیی هەستێکی زۆر خۆش و مەزنی هەیە، ئەو هەستی وایە کە لە تەواوی ئەو دەستکەوتانەی کە بەدەستی هێناون گەورەترە، بەو چاوەوە سەیری دەستکەوتە بەدیهاتووەکان ناکات کە بەڕێکەوت پەیدابووبن، یان شایستەیان نەبێت، بەڵکو پێی وایە کە زۆر لێهاتووانە بەدەستی هێناون و، زۆریش لەوان گەورەترە و، لە توانایدایە کە لە ئایندەدا شتی زۆر لەوە گەورەتر بەدەست بهێنێت، بۆیە دەبینیت کە بە کەم ڕازی نییە، بەڵکو بەردەوام هەوڵدەدات و، کاتێك سەرکەوتنێکی گەورە تۆمار دەکات ڕوو لە سەرکەوتنێکی تر دەکات.

تەواوی لایەنـەکانی کەسایەتی مـرۆڤ تـەنها لـە ڕێگـەی ڕەفتـار و هەڵسوکەوت و مامەڵەکردن لەگەڵ کەسانی دەوروبەردا ئاشکرا دەبـن، هـەر بۆیـە تـەواوی تایبەتمەندییـەکانی کەسـایەتی تـەنها لـە بـواری کرداریدا ڕەنگدەدەنەوە و ئاشکرا دەبن.

دەی چۆن بزانین کە فلانە کەس دڵفراوانە؟ ئەو کات دەزانـین کـە هەوڵبدەین تووڕەی بکەین و تووڕە نەبێت.

چۆن بزانین کـە فلانـە کـەس زوو هەڵدەچێت؟ یان فلانـە کـەس بەخشندەیە؟ یان فلانە کەس پاڵەوانـە؟ تـەواوی ئـەو شتانە لـە ڕێـی ڕەفتـارەوە دەزانـرێن، چـونکە ڕەفتـار ئاوێنەیـەکی ڕاسـتەقینەیە و، کورتکراوەی کۆمەڵێك تایبەتمەندی عەقڵی و هەستیی و دەروونییە کـە لە مرۆڤی ئەرێنیدا ڕەنگدەدەنەوە.

هەروەها لە ڕەفتارەکانی کەسی ئـەرێنیی ئەوەیـە کـە خـۆی لـەو بیرکردنەوانە دەپارێزێت کە بـەرەو ڕێگەیـەکی داخـراوی دەبـەن: هـەر بیردۆزێك مرۆڤ بە ئاقارێکی داخراودا بەرێت بیردۆزێکی هەڵەیە.

پێویسـتە بـەردەوام بـیردۆزی سـوودبەخش بەرهـەم بهێـنین، تـا بواری باشتر کارکردنمان لە ژیاندا بۆ بڕەخسێنێت.

شکستهێنانیش بەو ئەنجامە خراپانەمان ئاشنا دەکـات کـە ڕێگـە داخراوەکانمان پێ نیشان دەدەن، ڕاسـتە ڕێگاگـەلێکی داخـراو هـەن، بەڵام جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان ئاشنابوون بە ڕێگا داخراوەکـان

و، ئەوەی کە بڕوام وابێت کە: هەموو جیهان بریتییە لە ڕێگاگەلێکی داخراو!

زۆر کەسم بینیوە کە تەنها دەربارەی ڕێگاگەلێکی داخراو دواون و، تەواوی بڕواکانیان بەدەوری ئەستەم و ناکرێتدا دەسووڕێنەوە.. برا ئەوە ناکرێت و، کاکە ئەوە دوورە و.. تا دوایی.

ڕۆژێکیان لەگەڵ کۆمەڵە برایەکی فێرخوازدا کۆڕمان بەستبوو، پێم گوتن: وەرن با پەیمان بدەین لەم دانیشتنەماندا لە شتی ئەرێنیی بەولاوە باسی هیچی تر نەکەین، با باسی ئەو شتانە بکەین کە دەمانەوێن، خۆ بە ناشوکری نەبێت ئەمڕۆ لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانماندا باس هەر باسی ئەو شتانەیە کە نامانەوێن، ئیدی با دەسبەرداری ئەو شتانە بین کە نامانەوێن، وەرن با ئێستا لەو شتانە بدوێین کە دەمانەوێن، تۆ سەبارەت بەو پرسە چی بە باش دەزانیت، بۆچوونی خۆتم پێبڵێ.

هەر ئەوەندەی وەریچەرخێنیت لەو شتانەی کە نایەوێن بۆ ئەو شتانەی کە دەیەوێن ئیتر ئەرێنیبوون دەستپێدەکات.

جا ئەگەر وتی: من فلانە شتم دەوێت، دەڵێین: چۆن بیکەین؟ دەبینیت دەڵێت: بەو شێوازە دەیکەین.

بەڵام کاتێك کە لەبارەی ئەو شتانەوە دەیدوێنین کە نایەوێن، ئەوا هەمیشە بە هەڵوێستێکی نەرێنیتدا دەبات.

بڕوانە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا * إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا﴾ الشرح٥-٦.

واتە: (ئەمە بۆیە بوو چونکە بەڕاستی لەگەڵ هەر ناڕەحەتییەکدا ڕەحەتییەك هەیە. لەگەڵ هەر ناڕەحەتییەکدا ڕەحەتییەك هەیە).

بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەمیشە توانایەك لە ئارادایە، تەنگانەش لە دوای خۆشییەوە نایەت بەڵکو لەگەڵیدایە.

وەك بڵێیت خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی ئەو کەسەی کە خەم دایگرتوویت و هەست بە تەنگانە و قەیران دەکەیت! نیگەران مەبە خۆشی و ئاسانییەك لە ئارادایە، دەرگایەکی کراوە هەیە، بگەڕێ بەدوای ئەو خۆشی و ئاسانییەدا و ئەو دەرگا کراوەیەش بدۆزەرەوە.

کاتێك کە کەسێك باسێکی ئەرێنیی دەکاتەوە، سەیر دەکەیت خەڵکێکی زۆر بە ئەرێنیی دەکەونە قسەکردن لەگەڵی، بە دڵنیاییەوە لەو لایشەوە کەسانێکی ئاژاوەگێر و ڕەخنەگر و ناڕازی و ڕەشبین هەن، بەڵام هەموو خەڵکی وا نین.

زۆربەی خەڵکی هەر ئەوەندە کەوتیتە باسی شتە نەرێنییەکان، دەستبەجێ دونیایەك شتی نەرێنیت بۆ باس دەکەن، ئەگەر شتی ئەرێنیشیان بۆ باس بکەیت، زۆر شتی تری ئەرێنیت بۆ باس دەکەن.

هەر بۆیە ئەگەر هاتوو لە کۆڕ و کۆبوونەوەیەکدا زانیت کە خەریکە گفتوگۆکردنەکە بە ئاقارێکی داخراودا دەڕوات، دەبێت دەستبەجێ ڕایگریت و بڵێیت: با واز لەو باسە بهێنین و، بڵێ: ئەرێ

فلانـه کـەس مـن دەمێکـە لـەبارەی ئـەو شـتەوە نەمدوانـدویت، تـۆ لەبارەیەوە چی دەڵێیت.. ئا بەو شێوەیە دەتوانیت ڕێڕەوەی باسـەکە لە شتی خراپ و نەرێنییەوە بگۆڕیت بۆ شتی باش و ئەرێنیی.

**حەوتەم تایبەتمەندیی دەروونـی: دوورکەوتنـەوە لـە شتی باو و دووبارە و سوواو.**

مرۆڤـی ئـەرێنیی لـە سـەر ئاسـتی ڕەفتـار و هەڵسـوکەوتکردندا هـەوڵی خۆدەربـازکردن لـە شـتی وشـك و بـاو و دووبـارە دەدات، ئـەو کەسێکی تێگەیشتوو و کراوەیە بەڕووی شتە نوێیەکاندا، جا کاتێك کە باسی شتێکی نوێ و شێواز و ڕێگەیەکی نوێی بـۆ دەکـەیت، دەبینیـت کە بێ سڵەمینەوە و تێگەیشتووانە گوێت بۆ دەگرێت و وەریدەگرێت.

جیاوازییەکی زۆریش لە نێوان ئەوەدا هەیە کە تۆ بە شتێکی نوێ ڕازی بیـت و وەریبگریـت بـەبێ شـیکردنەوەو تـاوتوێکردنی، لەگـەڵ ئـەوەدا کـە شـتێکی نـوێ وەربگریـت و تـاوتوێی بکـەیت ئینجـا پێـی ڕازیبیت، واتە کەسی ئەرێنیی دەڵێت: من ئێستا ئامادەم کە گـوێبگرم و، هەروەها ئامادەشم کە جوان تێبگەم و بـەراورد بکـەم ئینجـا بڕیـار بدەم، بزانە چەند کەسێکی تێگەیشتوو و کراوە و بیر فراوانە، ئەمەیـە سـیفەتی دروسـت و ئـەرێنیی، پەلـە ناکـات تـا لێکدانـەوەی وردی بـۆ دەکات ئینجا بڕیار دەدات و، دەڵێت: (مـن بـە جـوانی و بـەوردی لـەو

شتەم كۆڵییەوە، شتێكی خراپە، یان بەو شتە ڕازی نیم).. بەم كارەی خۆی لە بیركردنەوەی بێزاركەر و باو و ڕۆتین ڕزگار دەكات.

دەقگرتن بە شتی باو و دووبارەوە وەڕست دەكات، هەر بۆیە هەرگیز پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دەقی نەگرتووە بە شتی وشك و وەڕسكەرەوە؛ واتە: بۆ نموونە دەقی نەگرتووە بە كاتێكی دیاریكراو بۆ قسەكردن و دیداری یارانی.. وەك ئەوەی هەموو بەیانیانێك یان هەموو نیوەڕوانێك یان هەموو عەسرانێك قسەی بۆ كردبن، شتی وا نەبووە، وەك لە فەرموودەكەدا هاتووە: ((**يتخولنا بالموعظة في الأيام كراهة السآمة علينا**)) [1] واتە كاتی ئامۆژگاریی و ڕێنماییەكانی دەگۆڕی نەبادا وەڕس و بێزار ببین، لە گێڕانەوەیەكی تردا هاتووە: (**يتحولنا**) [2] واتە چاوی بۆ ئەو كاتانە دەگێڕا كە چوست و چالاكین، لە گێڕانەوەیەكی تردا ـ كە ڕەنگە نامۆ بێت ـ هاتووە: (**يتخوننا**) [3] واتە: تاوانباری دەكردین و تاقی دەكردینەوە كە تا چ ئەندازەیەك گەرموگوڕیی گوێگرتنمان لە ئامۆژگارییەكەی تێدایە؟

كەواتە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) كاتەكانی ڕێنماییدانی بە یارانی دەگۆڕی، بۆ ئەوەی كە دەق بە كاری دووبارە و ڕۆتینەوە نەگرن و، بێزار و وەڕس نەبن.

---

١- البخاري، رقم:٦٨

٢- فتح الباري: ١/١٦٣

٣- سەرچاوەی پێشوو.

مرۆڤـی ئـەرێنیی شـێواز و هۆیـەکانی نوێدەکاتـەوە و، خـۆی بـە کۆنەوە نابەستێتەوە، هەر کەسێکیش بڵێت: هەموو شـتە کۆنـەکانمان شـتی چـاکن، ئـەوا دەیـەوێت دابونـەریت و بیروبـاوەڕ و ڕەفتـارە بێکەڵکـەکانی سـەردەمانی زوومـان بەسـەردا بسـەپێنێتەوە، نابێـت ڕێگەی پێبدەین.

بـەڵکو ئـەوەی پشتڕاسـتکراوەتەوە تەنانـەت گـۆڕینی شـتومەکی ناومالّ و، شێوازی دانان و ڕێکخستنیشی، مرۆڤ دڵی پێی دەکرێتەوە و هەست بە خۆشی دەکات.

بۆیە دڵگەرمی و چوست و چالاکی هەرگیز لە کەسی چەقبەسـتوو و دەقگرتوو بە شتی کۆن و دووبارە ناوەشێتەوە.

مرۆڤی ئەرێنیی: هەمیشـە کەسـێکی کـراوە و ژیـرە و، لـە ئاسـت شتە نوێیەکاندا تێگەیشتووانە مامەڵـە دەکـات، چـونکە دەزانێـت بـەو کراوەیی و تێگەیشتنەی شتی کۆن و دووبـارە و سـوواو بـەبادا دەدات و، دەڵێـت: ئـادەی بـا دەسـت بدەینـە تاقیکردنـەوە، لێبگـەڕێن بـا تێبگـەین، بـا وردبینـەوە، ئەوسـا بڕیـار بـدەین: ڕازی بـین یـان ڕەتکردنەوە هەڵبژێرین.

ئەو لە ڕوانگەی بیرکردنەوە و بڕوابوونیـەوە دەڕوانێتـە شـتەکان، بۆیە هـەر شـتێکی نـوێ کـە هاوکـار و بەدیهێنـەری ئامانجـەکانی بـوو بەدڵیـەوە دەنوسـێت و وەریـدەگرێت، مـادام دروسـت و سوودبەخشـە ڕەتی ناکاتەوە و دەستبەرداری نابێت، دەبا ئێمەش وابین.

بەڵام مرۆڤی ڕەشبین و نەرێنیی بەپێچەوانەوە: بەگومانەوە تەماشای نوێ دەکات و، پێی وایە هەر شتێك کە نوێ بوو لە نادروستەوە نزیکە.

من کەسانێك دەناسم کاتێك کە لە چەند وڵاتێکدا قوتابخانە کرایەوە، ئامادە نەبوون منداڵەکانیان ـ هەرچەند کوڕیش بوون ـ بخەنە قوتابخانەوە، بە بیانووی ئەوەی کە ئەم جۆرە فێرکردنە فێرکردنێکی هاوچەرخ و ڕێگەپێنەدراوە، سەرەنجام ڕۆڵەکانیان چوونە ڕیزی نەخوێندەوارانەوە، دەی لە کاتێکدا ئاشکرایە کە خوێندن و فێرکردن ئەوەندە سوود و قازانجی هەیە، ئەگەر زیانێکیشی هەبێت لە چاو ئەو سوودانەدا هەر هیچ نییە، بەڵام ئەوان لە ڕوانگەی دژایەتیکردنیانەوە بۆ شتی نوێ، تەنانەت قوتابخانەکانیشیان ڕەتکردەوە!

ئێستاش خەڵکانێکی زۆر پێیان وایە کە زانکۆکان شوێنی تێکدانی ڕەوشتی گەنجانن نەك پەروەردە و پێگەیاندنیان، ئەوەش بۆچوونێکی ڕاست نییە، من بۆخۆم لە ڕێی کاری زانکۆمەوە سەرنجی ئەوەم دەدا: کە هۆشیاری و خووڕەوشت و ڕەفتاری خوێندکارانی ساڵی چوارەم باشتر بوو لە هی خوێندکارانی ساڵی یەکەم، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە: زانکۆ ڕۆڵێکی باش دەگێڕێت.

بۆیە مرۆڤی ژیر و ئەرێنیی بەڕووی شتی تازەدا دەکرێتەوە، نەك بەو واتایەی کە هەموو شتێکی لا پەسەند بێت، بەڵام ئامادەیە کە هەر

شتێکی نوێ خێر و چاکە و سوودی تێدا بێت وەریبگرێت، لە هەمان کاتیشدا ئەگەر شتێکی خراپ و زیانبەخشیشی تێدا بوو، بەوپەڕی تواناوە بڵێت: ئەمە شتێکی خراپە و ڕەتیدەکەمەوە.

### هەشتەم تایبەتمەندیی دەروونی: کەسێتیی ئەرێنی.

لە تایبەتمەندییەکانی مرۆڤی ئەرێنیی لە ڕووی ڕەفتارەوە ئەوەیە کە: بەڕووی تەواوی بوارەکانی ژیاندا دەکرێتەوە و، بە ژیانی دوورەپەرێزیی و کەنارگیریی ڕازی نابێت و، پێی وایە کە نوێبوونەوە ئامرازێکە بۆ پاراستنی کار و مەبەستی سەرەکی، لەکاتێکدا مرۆڤی ڕەشبین و نەرێنیی پێی وایە کە گۆشەگیریی ئامرازێکی باشە بۆ پاراستنی خود.

کەسایەتی مرۆڤیش بە لەئەستۆگرتنی بەرپرسیاریەتی گەشە دەکات، هەربۆیە مرۆڤی گەشبین و ئەرێنیی هەوڵ بۆ کار و پیشەیەکی باشتر دەدات، هەوڵی بەدەستهێنانی شوێن و پێگەیەکی بەرزتر دەدات، دەیەوێت جموجووڵی زیاتر بێت و، چالاکانە کار بکات، هەم ببەخشێت و هەمیش وەربگرێت.

بەڵام مرۆڤی ڕەشبین و نەرێنی ڕازییە بەوەی کە بە سادەیی ژیان بەرێتە سەر، مشەخۆر و باربێت بەسەر خەڵکییەوە، وەرگرێت و نەبەخشێت و، گۆشەگیر بێت، ترس و بێهیوایی و کارنەکردن باڵی کێشاوە بەسەریدا.

## له كویٚ هه‌وڵه‌كانمان بخه‌ینه‌گه‌ڕ و ؟ له كویٚ هه‌نگاو بنێین؟

ئێمـــه دوو بازنـــه‌مان هه‌یـــه: بازنـــه‌ی كـــارتێكردن و، بازنـــه‌ی گرنگیپێـــدان، مرۆڤـــی ئـــه‌رێنیی زۆرتـــرین هـــه‌وڵ و تێكۆشـــان و بیركردنه‌وه‌ی خۆی له بازنه‌ی كارتێكردندا ده‌خاته‌گه‌ڕ.

**نموونه له‌سه‌ر بازنه‌ی گرنگیپێدان:**

- ئاگام له ڕه‌وشی موسوڵمانانی ئه‌نده‌نوسیا بێت.
- ئاگام له ڕه‌وشی موسوڵمانانی فه‌ڵه‌ستین بێت.
- ئاگـام لـه ڕه‌وشـی موسـوڵمانانی میسـر و سـوریا و بۆرمـا و ئه‌فریقیای ناوه‌ڕاست بێت.[1]

بازنه‌ی كارتێكردن: ئه‌و بازنه‌یه‌یه كه ئه‌گـه‌ر هـه‌وڵی خـۆمی تێـدا بخه‌مه گه‌ڕ، ئه‌وا ده‌توانم گۆڕانكارییه‌كی تێدا بكه‌م.

یه‌كه‌مین بازنه‌ی كارتێكردن خۆمم، من ده‌توانم گۆڕانكارییـه‌كی وا له خۆمدا بكه‌م كه له كه‌سی تردا بۆم هه‌ڵنه‌سووڕێت، چـه‌قی بازنه‌كـه خۆمم، هه‌ر له‌و بانه‌یه‌دا خێزان و دۆست و هاوڕیٚ و دراوسیٚ و شـوێنی كاركردن و.. تێدان.

---

١- ئه‌م خاڵی سێهه‌مه‌یان خۆم خستومه‌ته سه‌ری. (وه‌رگێڕ)

مرۆڤــی ژیــر و ئــەڕێنیی ٩٠٪ی هــەوڵ و تێکۆشــان و کــات و بیرکردنــەوە و توانــا و چــالاکی خــۆی بــۆ بازنــەی کــارتێکردنی خــۆی تەرخان دەکات، چونکە بە کارکردن لە بازنـەی کارتێکردنـدا دۆخەکـە دەگۆڕێت، خەون و خەیاڵ و قسەی زل هیچ لە دۆخەکە ناگۆڕن.

بەڵێ ئەو بایەخ بە گرفتەکە دەدات و لەبارەی ڕێگەچارەکانییەوە دەدوێــت و هەوڵــدەدات بــە باشــیی لێــی تێبگــات، بــە وردی لێــی دەکۆڵێتەوە، بەڵام ئەگەر هاتوو مـرۆڤ زۆربـەی کـات و هەوڵـەکانی لـە بازنەی گرنگیپێدانەدا خستەگەڕ، مانای وایە زۆربەی کاتی خۆی بـەفیڕۆ داوە و بێ کار و بێ بەرهەم ماوەتەوە.

ئێمـە ئیشـوکارمان دەوێـت، شـتێکمان دەوێـت ڕەوش و ژینگـەی نالــەبارمان بــۆ بگۆڕێــت، ئــەوەش تــەنها بــەکارکردن لــە بازنــەی کارتێکردنندا دێتـە دی. ئەگـەر ڕابمێـنین لـەم فەرمایشـتەی خـوا: ﴿لاَ تُكَلَّفُ إِلاَّ نَفْسَكَ وَحَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ النسـاء: ٨٤، دەبیـنین کـە قورئـانی پیرۆز دوو بازنەی گرنگی لە بازنەکانی کارتێکردن خستووەتە ڕوو:

یەکەم بازنەی سەرەکی کارتێکردن: ﴿لاَ تُكَلَّفُ إِلاَّ نَفْسَكَ﴾ واتـە: (تۆ لە کـاری خـۆت نـەبێت بـەرپرس نیـت. ئـەوەی لەسـەرتە نەفسـی خۆتە، بۆ خەڵکی تر تەنها تەبلیغت لەسەرە) .

واتە چ شتێك لە تواناتدایە و ڕەزامەندی خوای پێ بەدەست بێـت ئـەنجامی بـدە، ئـەوەی کـە خـوا فـەرمانی پێکردوویـت پێـی هەسـتە، چونکە ئەوە ئەرکی سەرشانتە و دەتوانیت ئەنجامی بدەیت.

بازنـــەی دووەم: ﴿وَحَـــرِّضِ الْمُـــؤْمِنِينَ﴾ە واتـــە: (هـــانی موسوڵمانەکان بدە لە ڕێگای خودادا بجەنگن).

بازنەی دووەمی کارتێکردنیش وەك هی یەکەم نییە، چونکە ئـەو دەسەڵاتەی پێغەمبەر (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) بەسـەر خۆیـەوە هەیەتی زۆرترە وەك لەوەی کـە بەسـەر هـاوەڵان و شـوێنکەوتووانەوە هەیەتی، شوێنکەوتووان ڕەنگە هەندێك جار بـەدەم داواکارییەکەیـەوە بچن و، هەنـدێك جـاریش ڕەنگـە نەچـن، بۆیـە خـوای گـەورە سـەرەتا ڕێنـوێنیکرد بـۆ بازنەیـەکی سـەرەکی کـارتێکردن، یـان بـا بڵـێین: ڕێنوێنیکرد بۆ چەق و ناوەندی بازنەکە، کە ئـەویش خـودی خۆیـەتی، ئینجا بازنەیەکی کەمێك فراوانتری لە بازنەکانی کـارتێکردنی نیشـاندا، کە ئەویش بازنەی یاران و شوێنکەوتووانە.

ئـەو کەسـەی کـە شـەش کاتـژمێر و حـەوت کاتـژمێر بـەدیار ئەنتەرنێتـەوە دادەنیشـێت تـا ئاگـای لـە هەواڵـەکان بێـت، ئەگـەر زانیارییەکان بۆ ئەوە کۆبکاتەوە کە کتێبێکی دەربارەی ئـەو کێشـە و ڕووداوانە پێ بنووسێت، ئـا ئەمـە بازنـەی کارتێکردنـە و، ئەمـە کـاری سەرەکی دانەرانە، دەخوێننەوە و دەنووسن.

بەڵام ئەگەر ئەو کارە تەنها بۆ زانیاریی بێت، ئەوە کات کوشتنە؛ چونکە ئێمە ئەگەر دەنگوباسی موسوڵمان یـان جیهانمـان خوێنـدەوە و، ئـەم خوێندنەوەیـە هـیچ کارێـك یـان نووسـینێك یـان پرۆژەیـەکی

تاکەکەسی لێنەکەوتەوە، مانای وایە تەمەن و کاتی خۆمان بەهەدەر دەدەین.

جا باشە ئەگەر ئەو حەوت کاتژمێر بۆ ئەوە تەرخان بکات، ئەی کەواتە کەی کار دەکات؟ کەی کاتی بەدەستەوە دەمێنێت تاوەکو گەشە بەخۆی بدات و پەرە بە تواناکانی بدات و، لە خوای گەورە نزیك ببێتەوە و، بار و گوزەرانی ژیانی باشتر بکات؟

بێگومان هەر دەبێت هاوسەنگیی بکات لە نێوان بازنەی کارتێکردن و بازنەی گرنگیپێداندا، پێیشم وایە کە لەسەدا ١٠ تا ١٥ی بۆ بازنەی گرنگیپێدان دەبێت، ئەوی تری پێویستە بۆ بازنەی کارتێکردن خەرج بکرێت.

## کەسی ئەرێنی چۆن بتوانێت ڕووبەڕووی کێشەیەکی دەرەکی ببێتەوە؟

نەتەوە مەزن و پیاوە مەزنەکان بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی کێشەیەك ببنەوە کە دووچاریان بووە، پشتوێنەیەکی ئەمنی بۆ ناوخۆی خۆیان یان وڵاتەکەیان دروست دەکەن.

بۆیە کاتێك کە وڵاتێك لە لایەن دوژمنەوە هێرشی دەکرێتە سەر، باشترین وەڵامدانەوەی ئەو دوژمنە ئەوەیە کە (بەرەی ناوخۆیی) یان (یەکڕیزیی ناوخۆ) سەرلەنوێ توندوتۆڵ بکرێتەوە، چونکە ئەگەر تەنها بەهۆی هێزی دەرەکییەوە توانرا هێرش بکرێتە سەر ناوخۆ، ئەوا ئەو وڵاتە پشتی دەشکێت و لەناوەوە تێکدەشکێت.

هەر کاتێك دوژمن زۆری بۆ هێناین و هێرشی کردە سەرمان، بێگومانبە کە هۆیەکی سەرەکی لەپشتە، ئەویش ئەوەیە کە خەتای خۆمانی تێدایە و خۆمان ڕێمان بۆ خۆش کردوون، زانیویانە کە ئێمە خۆڕاگرنین و زوو دەبەزین، بۆیە ڕوویان تێکردووین و دەستبەرداری ئەو شوێنانە بوون کە دەستیان پێیان ناگات.

دیسان لەسەر ئاستی تایبەتی و کەسییش: کاتێك کە مرۆڤ دووچاری کێشەی دارایی یان کێشەی ناو ئیشوکار یان کێشە و گرفتی خێزانیی یان لەگەڵ خزم و دراوسێکانی و چی و چی دەبێتەوە پێویستە بگەڕێتەوە بۆ لای خۆی.

**نۆیەم تایبەتمەندیی دەروونی: هەل و دەرفەتەکان لە دەرگای کەس نادەن.**

مرۆڤی ژیر و ئەرێنیی لەسەر ئەو بنەمایە هەڵسوکەوت دەکات کە دەرفەتەکان لە دەرگای هیچ کەسێك نادەن، بەڵکو پێویستە خەڵکی بە دوایاندا بگەڕێن.

خەڵکانێك لە مزگەوت سەرقاڵی یادی خوای گەورە بوون، فەرمانڕەوایەك چووە ژوورەوە بۆ لایان و، پرسیاری لەبارەی سەرچاوەی داهات و ڕزق و ڕۆزییانەوە لێکردن، لە وەڵامدا وتیان: ڕزق و ڕۆزیی ئێمە یەکلابووەتەوە.

فەرمانڕەواکە فەرمانی پێکردن بە کۆششکردن و، پێی وتن: **هەر یەکەتان هەستن و خەریکی پەیداکردنی نان و ڕۆزیتان بن، بەتەمان خوا لە ئاسمانەکانەوە بۆتانی ببارێنێت**[1].

لە میانی ئەزموونی چەندین ساڵەی خۆمەوە، بۆم دەرکەوتووە ئەو نەبوونی و بێ دەرەتانییەی کە زۆربەی خەڵکی پێوەی دەناڵێنن ئەوەیە کە نەگەڕاون بەدوای هەلێکدا، بەڵکو چاوەڕێن هەلێکیان بۆ هەڵبکەوێت!

هەل و دەرفەت لە دەرگاکان نادات و لەخۆڕا هەڵناکەوێت، هەزاران کەس هەن کە بەدوای هەلێکدا وێڵن، ئەوانەش کە بەدوای هەلێکدا - کە ڕەنگە پشکی تۆ بێت - وێڵن، ئەوە لە دەستی تۆ دەردەچێت و بەخت یاوەرت نابێت و، بۆ ئەوان دەبێت، چونکە ئەوان لە دەرگایان داوە و، چاویان لێی بووە و بەدوایەوە بوون، کەواتە هەر بۆ ئەوانیش دەبێت.

---

١- ئیمامی غەزالی لە (احیاء علوم الدین)دا ئەم چیرۆکەی داوەتە پاڵ خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێت)!..

مرۆڤی ئەرێنیی لە بری ئەوەی کە بڵێت: کۆمەڵگە هیچی بۆ دابین نەکردووین و، دەوڵەمەندەکانیش هیچیان بۆ نەکردووین، دەڵێت: دەرفەتێکم بۆ بڕەخسێت، هەر دەبێت بیقۆزمەوە و سوودی لێوەربگرم، بەڵام پێویستە خۆمی بۆ ئامادە بکەم و، بەدوایدا بگەڕێم، چونکە گەڕان بە دوای فرسەتێکدا بەبێ خۆئامادەکردن هیچ واتایەکی نییە.

ئاخر ئەوە کەی ڕاستە کە کەسێك بە دوای فرسەتێکدا وێڵ بێت کە پەیوەندی بە کار و پیشەکەی خۆیەوە نەبێت، هەرگیز ئەو گەڕان و بەدواداچوونە لە شوێنی خۆیدا نییە، کتومت وەك ئەو ئەندازیارەی لە نەخۆشخانەدا بەدوای چارەسەری گرفتێکی هونەرییدا بگەڕێت، نەخۆشخانەش چارەسەری نەخۆشییەکانی مرۆڤی تێدا دەکرێت نەك چارەسەری گیروگرفتی هونەریی!.

کەوابوو گەڕان بە دوای هەل و دەرفەتدا، واتە: خۆم بۆ ئەو دەرفەتە ئامادە بکەم.

هەمیشەش هەل و دەرفەت زۆرە، هەلەکانیش ڕوو لە کەس ناکەن، بەڵکو دەبێت خۆمان بەرەو پیریان بچین و، بەشێکیش لەو بەرەوپیرچوونەمان خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کە خۆمانی بۆ ئامادە بکەین.

دوا پەیاممان..

سوپاس و ستایش بۆ خوای جیهانیان

# پێڕست




# المسلم الإيجابي

لە کەشی ئەم جیهانە جەنجاڵ و پڕکێشەیەدا زۆرجار گەر بە کەسێك بڵێیت: "ئیجابی بە"، پێت دەڵێت: "ئاخر پێم ناڵێیت دڵم بەچی خۆش بێت!".. لەبەرامبەردا زۆر کەس پێیان وایە کەسی ئیجابی کەسێکی خۆگونجێن و بێباك و سازشکەرە کە هەرچی پێ بوترێت پێی قایل دەبێت، هەر یەك لەم دوو تێگەیشتنەش ناواقیعیانەن و لەجێی خۆیاندا نین!

بەوپێیەی (ئیجابی بوون) ژیلەمۆیەکە بۆ سازاندنی ژینێکی ئاسوودە و سەرکەوتوو لە واقیعی ئەمڕۆدا، بێگومان هەمووان پێویستیان پێی دەبێت، بۆیە پێویستیتان بە سەرلەنوێ تێگەیشتن لە چەمکی ئیجابی بوون و بنیاتنانی کەسێتییەکی ئیجابی ئەم کتێبە دەکاتە باشترین هاوڕێی دەستگیرۆییکار و ڕێنیشاندەرتان.

0-0190-0000-6
9 780019 000000

نرخی (٢٥٠٠) دینارە